# ئەفسانەی چیای ئاگری

یەشار کەمال



شوکور مستەفا

لە تورکییەوە کردوویەتی بەکوردی



ناوی کتێب: ئەفسانەی چیای ئاگری
نووسینی: یەشار کەمال
وەرگێڕانی لە تورکییەوە: شوکور مستەفا
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٩٦٠
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقیيان
چاپی دووەم، هەولێر - ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٧٥ی ساڵی ٢٠١٠ی دراوەتێ

## چەند وشەیەک لەبارەی نووسەرەوە

یەشار کەمال ئەو نووسەرەیە کە هونەرەکەی، بیروباوەڕی سیاسی، خامەکەی، و خودی خۆی لە بۆتەیەکدا تواندووەتەوە. هەر کە ناوی دێتە گۆڕێ ئەمانە هەموو تێکڕا بە بیردا دێن. ئەو بەرهەمانەی کە سەر بەم بیروباوەڕانەن هەمووی لە ماوەی ١٥ ساڵی نێوان ١٩٥٩ و ١٩٧٤دا نووسیون و بڵاوبوونەوە. سەرلەبەری بەرهەمەکانی بگری، دەبینی ئەوەی کە لە هەموویان ڕۆژانەتر و ئەمڕۆ دەیخوێنییەوە سارە لە بیرت دەچێتەوە و کامیان هەرە بابەتی دەمودەست و سەرپێیین، ڕاستەقینەی هەرە گشتی و هەرە بنەمایی لێ دەڕژێ. چاکەیەکی بەردەوام، جوانی، ڕاستی پەروەری، خزمەت دۆستی، پێشەنگایەتییەکی لێ دەچکێن کە قەت کۆن نابن و وشکاوهێنان بە خۆوە نابینن.

یەشار کەمال کە ملی بابەتێ دەگرێ و پەیتا پەیتا هەر ئەو بابەتە دوو گاسنە و سێ گاسنە دەکاتەوە و لە کوتانەوە و دووپاتکردنەوەی هیچ ناپرینگێتەوە، مەبەستی ئەوەیە سەرنجمان بۆ شتێکی ڕاستەقینەی ژیانێکی گرنگ ڕابکێشێ و لەگەڵ سەر و سیمای زەق و زۆپی هەڵکەوتدا بێ پەنا و پەردە بەرەوڕوو ببینەوە. ئەگەر پێشەکی بیر بکەینەوە، بڵێین: «دیسان کوێرانە ملی لە فلانە بابەت نا و دەستی بە بێڵتەپ کرد» و تەنانەت بە کەمیشی بزانین و بەسەریدا تێ پەڕین، پیاو بیەوێ و نەیەوێ ڕەوت و ڕۆی ڕووداوان بەرەو ئەو بابەتەی دەبا.

یەشار کەمال زۆری نووسینەکانی با ١٥ ساڵ لەمەوە پێشیش نووسرابن، کامیان دەخوێنییەوە، هەر دەڵێی بۆ ئەمڕۆ نووسراوە و کێ دەزانێ بۆ چەندین ساڵی دیکەش، هەر تازە و تەڕوبڕ و کەڵلەتەزێن و دڵڕەق هەژێن نابێ.

یەشار کەمال بابەتان زۆر دەکوتێتەوە، بەڵام هێند وەستایانە و نووسەرانەیان دووپات دەکاتەوە و دەکوتێتەوە، پیاو بە سانایی ناچێتەوە سەر ئەوەی پێشووی. مەبەستیش بیرو بڕوا لە مێشکدا چەسپاندن و جووتکردن و پەرچینکردنە. یا کارێکی وات تێ دەکا، وات شەقڵ دەکا، کێلەڕێی ئەوتۆت بۆ دادەنێ کە بابەتەکەیت - بشتەوێ - قەت لە بیر نەچێتەوە و شەقڵی بە هیچ کوێر نەبێتەوە. ئەمەش لەوەوە سەری هەڵداوە کە نووسەر لە ناو ژیانی بابەتەکەدا جێگای خۆی گرتووە و لێی نامۆ نییە و سەرتاپای لە خومخانەی ئەو ژیانە هەڵکێشاوە. قەت تووشی لە بڵندییەوە تەماشاکردن، سەرچڵانە بیرکردنەوە، کوتوپڕ بڕیاردان، سانایی، وشکە پەنداوان نایەیت و نایەی.

یەشار کەمال نەبەو نیازەی کە لە پشت هونەری چیرۆکنووسی و شەخسییەتی هونەرمەندانە و ناوبانگ و شۆرەتەوە کە تەنانەت هەرە خەنیم و دوژمنەکانیشی سەری لەبەر دادەنەوێنن، دەنووسێ و نەش فیزی نووسەری بەفیز لێ دەدا و نەش لافی پاڵەوانێتی و گۆی هەموو دەودەوانێ بردنەوەیەک لێ دەدا. ئەوە دەنووسێ بڕوای پێیەتی.

لە پێشەکیی کتێبی (باڵدەکی توز)

خوێی نێو هەنگوینەکەوە وەرگیراوە

گۆلێک بەسەر دوندی چیای ئاگرییەوەیە چوار هەزار و دووسەت مەتر بڵندە. نێوی گۆلی کووپەیە، هەر هێندەی شوێن جۆخینێک دەبێ، تا بڵێی قووڵە. گۆل نییە بیرێکە بۆ خۆی. بەردی سووری لووسی بریقەدار، رک رژد تیژ وەکو دەمی تیغ و سیکارد بە هەر چوار نکالیدا زەق و زۆپ، دەنە دەنە، شمش شمش هەڵزەقیون. خاکێکی نەرمی مس ڕەنگ لە بەردەکانەوە داڕنیوەتە خواری و رچە رچە و ڕەگ ڕەگ تووڵەڕێی باریک بەرەو گەرووی گۆلەکە دەکشێن و تا چاو هەتەر دەکا هەردێ و باریکتر دەبنەوە. جێ جێ ناسکە هەرێزی سەوز لەسەر ئەو خاکە سوورکانە مس ڕەنگە ڕوواوە، ئەنجا لە پاشان شینایی گۆلەکە دەست پێ دەکا بەڵام لە هیچ شینایییەک ناچێ. هیچ شینایییەک لە گوێن ئەم شینایییە نییە. شینێکی ئاسمانیی تێری نەرمی مەخمەڵییە.

هەموو ساڵێ کە بەهار لەگەڵ بەفر چوونەوەدا چاو هەڵدێنێ و نەورۆزێکی بە شان و شکۆ و پڕ هەیت و هووت لە چیای ئاگری دەتەقێتەوە. دەوروبەری گۆلەکە، جۆگەتی باریک، پڕ دەبن لە گولیلکی کورتەبنە و تیژ، ڕەنگیان تا خەیاڵ بڕکا گەش و ڕوونە. کامیان لە هەمووان چکۆلەترە، شین، سوور، زەرد، مۆر هەر یەکە لە ڕەنگێ خۆی دەنوێنێ، لە دوورەوە دەڵێی تیشکی ڕەنگە و دەچریسکێنەوە. بۆنیان زۆر تفت و تیژە. بۆن و بەرامەیەکی هێند تیژ لە نێو گۆلەکە و خۆڵە سوورەی مس ڕەنگ دێ ئیدی بە جارێ پیاو گێژ و مەست دەکا.



شوانەکان لەسەر گۆلی کووپە، لە چیای ئاگری بلوێر
دەژەنن

هەر کە بەهار لە چیای چاو هەڵدێنێ شـوانە چاو رەشـە جـوانە پرخـەمـە تێکسـمراوە قـامک درێژ و باریکەکانی چیای ئاگریش لەگـەڵ گولیلکان، لـەگەڵ بۆنی تیژ، لەگـەڵ رەنگان، لەگەڵ خـاکی مس رەنگدا بلوێرەکانیـان هەڵدەگرن و دێنە سـەر گۆلی کوویە. لەو بن زنارە سووورانەدا لەسـەر ئەو خۆڵە مس رەنگە، لەسەر سینگی ئەو بەهارە هەزار ساڵانەیە کەپەنکەکانیان رادەخەن و بە چوار دەوری گـۆلەکـەدا چوار مـشـقی لێی دادەنیـشن، بەر لە خـۆرکـەوتن لـە ژێر ئەستـێرە خـەرمـانکراوەکانی ئاگریدا کە هەمـیشـە کلـپە کلـپ دەسـووتێن، بلوێرەکانیـان لەبەر پشتـێنیان دەردێنن و دەست بە بلوێرلێدان دەکەن و تا رۆژ ئاوا دەبێ تووڕەیی هەزاران سـاڵی ئاگری هەڵدەرێژن. لە زەردەپەردا مـەلێکی چکۆلەی سپی وەکو بەفر بەسەر گۆلەکەدا دەست بە فرین دەکا. باڵندەیەکی بەلەباریکەی درێژکـۆلەیە، هەر دەڵێی پەرەسـێلکەیە، زۆر خـێـرا و تیـژ دێ و دەچێ، پەیتـا پەیتـا ئاڵقـەی درێژ درێژ و سـپی دەکێـشێ، ئیـدی هەر ئاڵقـەی سپییە و تاڵ تاڵ دەکەونە نێو شینایی گۆلەکەوە، ئەوجا، کە بە تەواوی رۆژ ئاوا دەبێ بلوێرژەنەکان دەست لە بلوێرلێدان هەڵدەگرن و بلوێرەکانیـان لەبەر پشـتێنیـان رادەکـەنەوە و هەڵدەسـتن. مـەلەکـەش، لەو دەمی بە هـەمـوو هێـز و گوڕێکیـەوە، وەکو تریشـقـە دێتە خوارێ و شـاباڵێکی سێ جاران لە شـینـایی ئاوی گۆلەکە وەردەدا و بۆی هەڵدەسـتێتەوە و لێ دەدا دەڕوا، لە چاو ون دەبێ. شـوانـەکـانیش لە پاش وی یـەکـە یەکـە و دوو دوو لێک هەڵدەبڕێن و لـەگـەڵ تاریکاییدا تێکەڵ دەبن و دەڕۆن.



کۆشک و سەراکەی

لە دوێنێ ئێوارێوە ئەسپێکی کوێت لەبەر دەرکەی ماڵی ئەحمەد وەستا بوو. ملی درێژ کردبوو، دەتگوت بە کونەلووتە هەراوەکانی بۆن بە تەختەی دەرکەوە دەکا. لە پێشدا سۆفیی ڕدێن سپی ئەسپەکەی دیت، ئەسپەکە زینێکی چەرکەسییانەی زێودۆزی لێ کرابوو. زەنگوڵەکەشی هەر زێودۆز بوو. سۆفی بە کۆمە کۆم لە ئەسپەکەی نێزیک بووەوە، لەولاوە قەدەرێ تێی ڕاما. دەستە ڕەشمەکەی سورمەهۆن بوو و بە کەڵپووسە زێڕە سەدەف کوتەکەوەی بەسترابوو. نەرمە زینێکی چاک گێڕدراو بەسەر هەردوو لاتەرکیدا کشابوو. وێنەیەکی لەمێژینەی زۆر کۆنی ڕۆژ، لەوە دەچوو هی سەردەمانی زۆر زوو بێ، لەسەر هەردوو دیوی نەرمە زینەکە نەخش کرابوو. ڕەنگی ترنجییەکی تێر بوو، وێنەی دارێکی بڵندی ژیانیش لە پشت وێنەی ڕۆژەکەوە، سەوز سەوز، بەرەو ئاسمان هەڵچووبوو. سۆفی ئەم ڕۆژەی، ئەم دارەی لە شوێنێ دیتبوو. خەیاڵ بردییەوە. ئەم وێنە و نەخش و دروشمانە وێ دەچوو هی هۆزێکی بەناوبانگ و تیرەیەکی گرینگ بێ. سۆفی نەختێ سڵەمییەوە و شڵەژا. بگرە تۆزێکیش ترسی ڕێ نیشت و لەولاوە ڕەق ڕاوەستا: دەبێ ئەم بەناوبانگە کێ بێ، ئەم میوانە گەورەیە لە کوێوە هاتبێ؟ وێنەی دروشمەکەی لە مێشکیدا دێنا و دەبرد، هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا نەیدەزانی بیباتەوە سەر فلانە هۆز، یا فیسارە بەگ و پاشا و هیچ سەرە و دەرەی لێ دەرنەدەکرد، تا پتری بیر لێ دەکردەوە هێندەی دیکەی سام ڕێ دەنیشت. ئەم جۆرە دروشمانەی پێ شووم و بەدووم بوو. پێ و قەدەمیان بە خێر نەبوون و بە ترسەوە دەهاتن و بە ترسەوە دەڕۆیشتن. لەو هەرێمانەدا کەسی وا نەبوو ئەسپ بەو ڕەنگە برازێنێتەوە وێڕای ئەوەش سۆفی دروشمی هەموو هۆز و تیرەکانی ئەو هەرێمانەی بە چاکی دەناسییەوە و هیچیانی لێ نامۆ نەبوو.

بەهار بوو. بەفری چیای ئاگری ڕووی لە چوونەوە بوو. لە خوارێ، لووتکە و ترۆپکی ڕەوەز و زناران زەق و زۆپ بەدیار کەوتبوون. گولیلکی زەردی نێو بەفران سەریان دەرێنابوو. لە دوورەوە قولینگ دوا بەدوای یەک، پۆل پۆل ڕیزیان بەستبوو و تێ دەپەڕین، بەرەو گۆلی وان دەچوون. ئەحمەد ئاگای لە هیچ نەبوو، بەو تاریک و ڕوونە لە ژوورەوە دەنگی بلوێر دەهات،.. سۆفی ئەم ئاوازە بلوێرەی لە پێشوونانەوە زۆر بیستبوو. سولتان ئاغای باپیری ئەحمەدیش هەر بەو ئاوازە بلوێری دەژەنی، ڕەسووڵی باویشی هەر وای دەژەنی. تا ئێستا بلوێرژەنێکی دیکەی وا، مەگەر سۆفی، لە هیچ بنەماڵەیەکی ئاگریدا، لەسەر ڕووی زەوی نەهاتبووە سەر ئەو دنیایە، چونکە سۆفی بەناوبانگترین بلوێرژەنی ڕۆژهەڵات و قەفقاس و ئێران و تووران بوو.

سۆفی کەمێ لە ئەسپەکە نێزیکتر بووەوە، نۆڕییە دروشمەکە. ئەسپی تاین وای گوێ بۆ دەنگی بلوێرەکە راداشتبوو، دەتگوت گوێی لێ گرتووە. ئەحمەد گۆرانییەک، توورەیی چیای ئاگریی دەژەنی. ئەم گۆرانییەش تەنیا سۆفی فێری بلوێرژەنانی کردبوون.

ئەسپەکە ملی زۆر جوان بۆ دەنگەکە درێژ کرد. سۆفی لەمێژبوو ئەو داستانەی نەژەنیبوو، نەیبیستبوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت چیایەکی وا گەورە و گران چۆن لە دەنگ و ناڵەی بلوێرێکدا هێند توورە دەبێ و بەو ڕەنگە دڵی کڕ دەگرێ، ئیدی هەروا بە سەرسامییەوە بیری دەکردەوە.

دەیگوت: چ لە مرۆڤ بلیمەتترە، بەڕاستی ئەقڵ بڕی پێ ناکا. تۆ تەماشە، تەماشا چیایەکی وا گەورە و زەلام لە کونی بلوێرێکی هێندە تەسک و باریکەوە دەردەپەڕێنێ. ئەم مرۆڤانە جڵەوی ئەقڵ و هۆش بەرەو هەموو شتێ شۆڕ دەکەن، لە سڕی فڕینی شەهێن و باز دەگەن، پەی بە پەنامی هەڵپەی ژیان و شارستانێتیی مێروو دەبەن، مەتەڵی مانگ و ڕۆژ هەڵاتن و ئاوابوون هەڵدێنن. سڕی مردن و ژیانیش ئاشکرا دەکەن، پەردە لە ڕووی هەموو شتێ هەڵدەماڵن، ئەقڵیان بڕ بە تاریکی و ڕووناکی دەکا، بیریان بۆ هەموو شتێ دەچێ، بەڵام تەنیا لەگەڵ مرۆڤدا هیچیان پێ ناکرێ و ئەقڵیان بە هیچ سڕێدا



ڕاوەستانی ئەسپەکە لەبەر دەرکەی ماڵی ئەحمەد

ئاشكێ و ئاگەنە ڕاز و نیازی دڵی.

چیای گۆڕین لەو دەنگ و ناڵەی بلوێرەدا وەرەوت کەوتبوو، ڕێی دەکرد، هەڵدێر، تلە بەفر، هەرەس، شەوی ساماڵ، ستێر و پێور دەتەقینەوە، مانگەشەو دەتەقییەوە، چیا بە هەموو ڕک و تووڕەییەکیەوە هەنگاوی هەراو و بەرینی هەڵدێناوە. ئاگری وەکو دێوێکی زەبەلاح ئارەقەی ڕەش و شینی دەردەدا، هەناسەبڕکێی بوو. سۆفی لە ناخی ناخەوە گوێی لە هەناسەی ئاگری بوو، زۆر لە دوورڕا، بەرەو ناوەندی دنیا پشوو بە گرم و هۆڕێک دەدرا. ئەحمەد دەیژەنی، هەناسەی ئاگری، تووڕەیی ئاگری تا دەهات پتری پەرە دەستاند. ئەو دەمی سۆفیش گوێی بە خاکی پڕ گرم و هۆڕی چیاوە دەنا. چیا هێندەی دیکە تووڕە دەبوو، پشووی سوار دەبوو، هەناسەی قووڵ دەبووەوە، جارێ شاخی دەکرد، جارێ باڵی دەکرد ئەوجا هەپروون هەپروون دەبوو و بە هەموو تووڕەیی و ڕک و کێش و گرانییەکیەوە بەسەر دنیادا دەقوپا و ڕۆ دەچوو. پاشان خامۆشییەک دنیای دادەگرت، هەموو شتێ بێ سەروبەر و بۆش و بەتاڵ، چیای ئاگری سەری خۆی هەڵدەگرت و لە دنیای ئێمە دەکشایەوە. گورگ و پەلەوەر و مرۆی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت، ستێر و مانگ و ڕۆژ، با و زریان، بەفر و باران، گوڵ و گولیلکانی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرت و دەیبردن و ئەو دنیایەی بە بۆش و بەتاڵی بەجێ دەهێشت. ڕەوە مامزی زێرکفتی پڕ دەشت و دەرانی لەگەڵ خۆی دەبرد و دەڕۆیشت. بۆشایی و خامۆشی لە نێو دەنگی بلوێرەکەدا دەمەیی و قەتیس دەما.

لە پاشان دنیا بە هەموو گوڵ و گولیلکانەوە، بە ستێرەوە، بە بۆن و بەرامەیانەوە، بە ڕووباری ڕوونی پڕ سوورە ماسییەوە، بە چۆڵ و دەشتی پڕ ئاسک و مامزانەوە، لە نکاو، لە پێش چاوی سۆفی پشکووت و خەملی. ئەسپەکەی پێش دەمی گۆڕا. ڕۆژی سەر نەرمە زینەکەی وەگەشە کەوت و چریسکایەوە، داری ژیان گەڵای وەری و گوڵی کرد.

بلوێر پشووێک کربوو. ڕۆژیش لە پشت لووتکەی ئاگرییەوە شاباڵێکی وەکو قاشی سوور دەرخستبوو.

سۆفی بە خۆدا هاتەوە، جارێ نۆڕییە دەرکەی. ئەسپەکەش سەری هەڵبڕی، بە چاوە درشت و خەمگینەکانی تەماشایەکی سۆفیی کرد. سۆفی ترسێکی بێ سەرو شوێنی ڕێ نیشت، قیژاندی.

«ئەحمەد ، ئەحمەد».

ئەحمەد دەنگی سۆفیی ناسییەوە، بەرەو دەرکە هات، دەرکەی لێ وەکرد، گوتی:

«فەرموو خاڵە».

ئەحمەد هەر کە ئەسپەکەی دیت، پێشان شڵەژا، ئینجا سەیرێکی ئەسپەکە و سەیرێکی سۆفیی کرد.

سۆفی پرسی:

«میوانەکەت کێیە ئەحمەد، بەخێر بێ و خێر و بێری بە پێوە بێ».

ئەحمەد وەڵامی داوە، گوتی:

«میوانم نییە».

ئەوجا هەردووکیان تەماشایەکی ئەسپەکەیان کرد.

ئەسپەکە لە دەرکە دوورکەوتەوە، جارێکی بە دەوری ماڵێدا خولاوە، هات دیسان لەبەر دەرکە وەستا. ئەسپێکی درێژ بوو، گوێی قوت کردبووەوە. سەری بڵند کرد، وەکو بییەوێ بحیلێنێ ... بەڵام نەیحیلاند...

ماڵی ئەحمەد لە بناری ڕەوەزێکدا بوو. چوار دەوری بە بەردی سووری نەتاشراو شوورە کرابوو. دەرکەی گەورەبوو، تەنیا یەک پەنجەرەی پێوە بوو. سۆفی بیری کردەوە. ئەحمەدیش بیری کردەوە.

سۆفی گوتی:

«ئەم ئەسپە بەشی تۆیە».

ئەحمەد گوتی:

«ڕاستە، مادام هاتووە لەبەر دەرکەم وەستاوە، دیارە بەشی منە بەڵام دەبێ

ئی کێ بێ؟».

سۆفی گوتی:

«دروشمی خۆی به نەرمە زینەکەوەیەتی. چاوم ڕەشکە و پەێشکە دەکا، وێ دەچێ دروشمی شوێنێک، ئی سەردەمانێک، ئی بنە و بنەچەکێکی زۆر کۆن بێ. هەبێ و نەبێ دروشمی شوێنێکی بەدووم و شووم و ترسناکە. بەڵام ئی هەر کەسێک بێ با ببێ، ئەم ئەسپە ئی تۆیە، خوا بە دیاری بۆی ناردوویە بەر دەرکەی».

ئەحمەد گوتی:

خۆشییە، شووم و بەلایە؟

ئەو سێبەر و تارماییەی لە ڕووی ئەحمەد نیشت سۆفیش خوێندیەوە:

ئی هەر کەسێک بێ با ببێ، ئەم ئەسپە ئی تۆیە، بەڵام چاوم ڕەشکە و پێشکە دەکا، پێم وایە دروشمەکەی ئی سەردەمانێکی زۆر کۆنە.

وێڕای ئەوەش ئەسپی بە ڕەخت و سینەبەند و زینی وا ئی ئەم و ئەو نەبوو.

سۆفی گوتی:

«زۆری بیر لێ مەکەوە، ئەسپەکە ببە لەو ڕێگایەی خوارێ بەرەڵلای کە و بگەڕێوە، ئەگەر گەڕاوە بەردەرکەت، جارێکی دیکەشی ببە ڕەهای کە و سێ جارانی ئەو کارە دووپات کەوە، ئەخێر هەر گەڕاوە بەردەرکەی ماڵت، ئەوە ئی خۆتە، جا خوا دەیکرد خاوەن ئەسپ بەگ دەبوو، پاشا دەبوو، پادشای عوسمانلی، شای عەجەم دەبوو، ڕۆستەمی زاڵ دەبوو، ئەگەر سەرت لە ڕێ داوە ئەم ئەسپە نەدەی. وە ناشی دەین.

ڕۆژهەڵات، هەوری زێرکەفت، گەواڵە گەواڵە لێک هەڵبڕان. بەفر و بەستەڵەکان، تەم و مژی ڕووناکییەکی پرشنگداریان ڕێ نیشت. ئەحمەد ئەسپەکەی گرت، ئەسپ دەساژۆ بوو، سواری بوو، بەرەخوار ئاژوای، لەوێ ڕەهای کرد و گەڕاوە.

بەڵام کە گەڕاوە، چیی بینی؟ ئەسپەکە جوان و زەریف لە کن سۆفی

وەستابوو، خۆلاسە ئەو کارەی سێ جاران دووپات کرەوە.

ئەحمەد گوتی:

«خاڵە، چارەنووس هەر دەبێ بێتە دی».

هەر چۆنێ بێ ڕۆژێ خاوەن ئەسپ لە ئەسپی خۆی دەگەڕێ و لێی دەپرسێتەوە. جا هەر کەسێ دەبێ ببێ. خۆ ئەحمەد ئەگەر سەری داوە ئەسپەکە ناداتەوە.

ئەسپی کێشایە سەر ئاخوڕ. شادیش بوو و دەشترسا. لەوەتی خۆی ناسیبووەوە ئەسپی وا جوانی نەدیتبوو.

سۆفی بە خۆشی خۆشی گوتی:

«تەقا خاوەن ئەسپ شیر حەرام بوو پێی لێ لە کەوشێ کردین: ئیللان و بیللان ئەسپی خۆم دەوێتەوە، خۆ ئەوە بێ سێ و دوو دەقەومێ و ئاگریش هەر هێندە سەری گەرم بوو، بە گژ هەموو دنیادا دەچێ و هەنگێ نێرم دەوێ لە ڕاستی بلێ لەل ...»

ئەحمەد هەڵی دایێ:

«بە گژێدا دەچێ و پتریش».

ئەوانی کە لە پێش هەمووان بە کەین و بەینی ئەسپی کەحێلەیان زانی خەڵکی گوندەکان بوون. هەموو هاتن ئەسپەکەیان دیت. پێشان گوندە نێزیکەکان، ئەوجا دەوروبەری ئاگریی پێ حەسییان. هەموو هاتن دیتیان. لە ماوەیەکی کورتدا نێوبانگی ئەسپەکە بە ئێران و توورانداا بڵاوبووەوە.

هەر کەسە لە بارەی ئەم بازەی کە بەسەر ئەحمەدەوە نیشتبووەوە سەدەقی خۆی لێ دەدا، یەکێ بە خێری لێک دەداوە، یەکێ بە شەڕ.

پاشان لە پێدەشتەکانی خوارێ، لە قەرە کلیسە و کیهادین و ئیغدیرەوە ئاغا و بەگ و گەورەی کوردان بیستیانەوە. هەموو بۆ دیتنی ئەسپەکە هاتن و ئێرەییان بە بەختی ئەحمەد دەهاتەوە.

ماوەیەکی دوور و درێژی خایاند کەس بە سەر و سۆراخی ئەسپەکەوە

نەهات و خاوەنی ئاشکرا نەبوو.

ئەحمەد سواری ئەسپی خۆی دەبوو، لەگەڵ دەستەبرا و هاوالانیدا بەرەو خاکی ئێرانێ دەیئاژوا، تالان و برۆی خۆی دەکرد. لە سامان، سامان، لە پەز و مەڕ و مالات، پەز و مەڕ و مالات، لە ئەسپ، ئەسپ رای دەماڵین، بەرەو ئاگریی دێنان.

بەلام هەمیشە دڵی لە پەژارە و وەرە ورتدا بوو. خاوەن ئەسپ هەر کەسێ بێ، رۆژێ دێ بەدیارکەوێ، بەلام دەبێ کێ بێ؟ رەنگە بەگێکی چاو بە خوێنی کەللەشەقی وابێ کە لە کەلی شەیتان نەیەتە خوارێ، یا بوودەڵەیەکی هیچ و پووچ بێ و لە سێبەری خۆی بسڵەمێتەوە.

شەش مانگی بەسەردا تێ پەڕی. ئەحمەد ترسیش و پەژارەش و خۆشیشی لە بیر چووەوە. رۆژێکیان، سبیانێ کاتێ هەتاو، سوور سوور لە گەردنی ئاگری ئالابوو، سۆفی دەست بە گۆچان و ڕدێنە درێژە لەرزۆکەکەوەی هاتە کن ئەحمەد پرسی:

«ئەحمەد بیستتەوە؟»

«بیستمەوە».

سۆفی:

«گۆیا ئەوی ئەسپەکەی بداتەوە پێنج ئەسپ و پەنجا زێری پاداشتە».

ئەحمەد:

«ئاوها».

سۆفی:

«لە ماڵی هەر کەسێک، بە دەستی هەر کەسێکەوەی ببینن سەری دەپەڕێنێ».

ئەحمەد:

«چ بکەین، ئەسپەکە یادگاری منە».



ئەو جێی ئەحمەد گوتی: «ئەسپ ئەسپی خۆمە»

«لەشکرمان دەکاتە سەر».

«ئەسپ یادگاری خۆمە».

«مەحمودخان پاشایەکی زۆردارە».

«ئەسپ قسمەتی منە».

«کەڵەومکێشی لەگەڵ مەحمودخان ناگرێ».

«ئەم ئەسپە خەڵات و یادگارە و خوا پێی بەخشیوم».

«مەحمودخان هەق و مەق، یادگار و خەڵات بە شاییەک ناکڕێ. بووە بە عوسمانلیی چەکمەڕەق».

«ئەسپ خەڵاتی خۆمە».

مانگێکی نەخایاند، پیاوانی مەحمودخان هاتنە ماڵی ئەحمەد، گوتیان:

«پاشا دەڵێ: لە ماڵ و سامان، ماڵ و سامان. لە ئەسپ، ئەسپ، لە دراو و زێڕ، دراو و زێڕ، خۆی سەرپشک بێ، چی دەوێ دەیدەمێ. هەر هێندە ئەسپەکەم بداتەوە. مادامێکی ئەسپەکەم چۆتە بەر دەرکی ئەو، چیی دەوێ دەیدەمێ».

«چما خان بۆ خۆی نازانێ، ئەسپەکەم بە خەڵات بۆ هاتووە و خەڵاتیش بە کەس نادرێتەوە. سەر دەدرێ، ئەسپ نادرێ. گۆیا خان خۆی ئەمە نازانێ؟».

«پاشا ئەمە دەزانێ، بەڵام وێڕای ئەوەش ئەسپی خۆی هەر دەوێتەوە. ئەسپەکە بۆ ئەویش هەر یادگار و خەڵاتە، یادگاری بەگی زیلانە، کە هێندەی برایەکی خۆی خۆش دەوێ».

ئەحمەد ڕاست و ڕەوان لە مستی نان، گوتی:

«لە سامان، سامان، لە گیان، گیان، چیی دەوێ دەیدەم، بەڵام یادگاری خۆمە و نایدەمەوە».

پیاوەکان گوتیان:

پاشا دەڵێ: بەو چیا بڵندەی پشتی و بەو چەند هەرچی و پەرچییانەی سەر

چیاوە نەنازێ. چیاکەشی و ئەوانی سەریشی لەگەڵ عارددا دەکەم بە یەک و دەشیکا».

«ئەحمەد ئیدی لەسەری نەڕۆیی. سۆفیش هیچی نەگوت. پیاوەکانی پاشا دەست لە گونان درێژتر، بە توورەییەوە لەوێ هەڵبڕان».

دراوسێ، گوندەکانی دەوروبەر، بەگە کوردە چاو بە خوێنەکان هەموو لە دەوری ئەحمەد کۆبوونەوە، گوتیان:

«کێ دیویە، کێ بیستوویە». ئەسپێک لەکن خواوە بەیادگار بۆ پیاو هاتبێ، با خاوەنەکەی پاشاش بێ، بدرێتەوە».

ئەحمەد گوتی:

«کێ دیویە و کێ بیستوویە». هەر هێندەی گوت و هیچی تر.

پاشا ئاکامەکەی بەو ڕەنگە چاوەنۆڕ نەبوو. هەر کە وەڵامی ئەحمەدی گەیشتێ لە ڕکان شێت بوو. ئەو خۆی لە دوا ڕۆژی کارەکە گەیبوو و دەیزانی ڕووی بەرەو کوێیە. ناوەڵڵا با ئەسپێکی وا لەبەر کۆشکی خۆی وەستابا، جا خوا دەیکرد ئەسپی پادشای عوسمانلی، یا شای عەجەم دەبوو، سەری دەدا ئەسپی نەدەداوە. نەیدەداوە، بەڵام ئەم ئەحمەدە، ئەم هەرچی و پەرچییە چیاییە دەبێ چ بێ و چ کارەبێ؟

دەبوو ئەسپەکەی وەدەست کەوێتەوە. کۆشک و سەرای بەیەک دادا و دەوروبەری هێنا وەلوەلایێ. دەمڕاست و ڕدێن سپی، سەرۆک و سەر لەشکرانی هەموو کۆکردەوە، بەڵام بەهیچ بڕیارێک نەگەیشتن. لە نێوچاوانی ئەم ئەسپەوە ورد و درشتی چیای ئاگریی لێ ڕاپەڕین. ئەحمەد بە تەنیا نەبوو.

پاشا بەگە کوردە دۆستەکانی، کە قەتی لە قسە دەرنەدەچوون، بانگ کردە کۆشکی خۆی، بەگەکانی وانێ، پاتنۆسێ، بەگەکانی چیای سویحانێ، مووشێ، بتلیسێ، هەموو بە سواری ئەسپی جوان و ڕەسەنەوە داوەرینە پێش کۆشکی مەحموود خان. مەحموود خان زیافەت و میوانداریەکی بە شان و شکۆ و بە هەیبەت و هووتی کردن. میوانەکانی بە شێوەیەک پێشوازی کردن،

نەبووە و نەبیستراوە، پاشان کۆڕی بەست، کەین و بەینەکەی پێ ڕاگەیاندن، لەو بەڵای لابەلایەی بەسەری هاتبوو حاڵیی کردن.

دەیگوت:

«قەت بووە و بیستراوە، هەرچی و پەرچییەکی چیایی، ڕێگرێ، هەتیوێکی دەمڕووت، ئەسپی من داگیرکا. چ لەمە نەنگ و سووک و کرێتتر دەبێ بۆ من؟».

کەس هیچی لە بارەی یادگارە بۆرەوە بە پاشا نەگوت. نەیانگوت: ئەگەر خەڵکی چیای ئاگری هەموو سەریان چووە، جارێکی دیکە ئەم ئەسپە چاوی بە دەرکەی ئەو ناکەوێتەوە. هەموو کڕ بوون. ئەمان دایانە بێدەنگی، پاشا تووڕە بوو، ڕاست و ڕەوان گوتی:

«ئەو ئەسپەم لە ئێوە دەوێتەوە».

بەگە کوردەکان، ناچار و نابەدڵ، تکاکاریان نارد بۆ تکا لە کن خەڵکی ئاگری. ئەحمەد نەک هەر ئەسپی بەوانیش نەداوە، بگرە وەڵامێکی تاڵ ژوقوماویی بۆ ناردنەوە، گوتی: چما ئەوان نازانن ئەمە یادگارە و خۆی بە پێی خۆی هاتووەتە پێش دەرگام و سێ جارانیشم بەرهەڵدا کردووە و هەر سێ جارەکەش ڕێ و ڕاست گەڕاوەتەوە و ئەسپیش بە کەس نادرێتەوە؟ ئەمە ئەسپی من نییە، بۆ خۆی هاتووە بەسەر سەری ئاگرییەوە نیشتووەتەوە. ئەوانەی بوون بە بەگ، چۆنیان دڵ دێ و زمانیان چۆن هەڵدێتەوە داوای ئەسپی ئێمە بکەن؟ ئەوانە نەک بوون بە بەگ، بگرە بوون بە بەندەی گوێ لە مستی پاشا.

بەگە کوردەکان بەم قسانەی ئەحمەد تووڕە نەبوون، لێیان نەگرت، گوتیان ئاگرییاییەکان هەقیانە. بەڵام چار ناچار بوو. پاشا دەبوو هەموو شتێکی بۆ وەدەست خستنەوەی ئەسپەکەی ڕەچاو کردبا.

کاتێکی هیچی لە بەگە کوردەکان هەڵنەکراند، خۆی کۆک و تەیار کرد، لەشکری کۆکردەوە، بەگە کوردەکانیشی ڕەگەڵ خۆی خستن، چوون بەسەر



بەگە کوردەکان، لە قسەکانی ئەحمەد تووڕە نەبوون و

گوتیان ئەحمەد لەسەر هەقە

ئاگریدا بدەن. پایز بوو، داوێنی چیای ئاگری جێ سوتمان بوو. بەردەلانی سوور، مۆر، وردە تاوێری چورووک و پووکەڵ، لەژێر ناڵی ئەسپەکانیاندا وەکو لافاو هاژەی دەهات و دەخزا. دەمەو عەسرانێ بوو، گەیشتنە گوندی سۆریک، کە گوندی ئەحمەد بوو. گوندەکە کش و مات بوو. زیندەوەرێکی تێدا نەبوو. لەشکر مۆڵ درا. دوایی پاشا فەرمانی سووتاندنی گوندەکەی دا.

لە ماڵێکی ئاگر تێبەردراوەوە، پیرێکی زۆر بەتەمەن، ڕدێن بژ، مووی برۆ بەسەر چاودا شکاوە و شێواو، شەل و شەپکێکی شینی نرت و نوێی لەبەردا بە پیری پاشاوە هات. ئەم پیاوە سۆفی بوو. زەق زەق نۆڕییە پاشا، چاوی دەتگوت چاوی خەرتەلە، ئاورینگی لێ دەبووەوە، گوتی:

«پاشا، ئەم هەمووە بۆ ئەسپێک؟ لەوەتی دنیا، دنیایە کێ ئەسپێکی بەپێی خۆی هاتبێتە بەردەرکە بۆ خاوەنی گێڕاوەتەوە؟ چما تۆ بۆ خۆت نازانی پاشا؟ پاشا، تۆ بووی بە عوسمانلی، دەنا بۆ ئەسپێ ئەم هەموو کارەساتەت بەسەر نەدێنایین. ماڵ و حاڵت نەدەسووتاندین. وەجاخت لێ کوێر نەدەکردینەوە. تووک و نفرینی ئاگریت لێ بێ. بەردی ئاگریت لێ وارێ. بەر غەزەبی ئاگری کەوی پاشا. تۆ قەڵب و زۆڵەک دەرچووی پاشا. باوکت ئەسپی یادگاری لە کەس داوا نەدەکردەوە. ئەگەر ئەسپێکی لە پێش دەرکەی بێوەژنێ، بێ داک و باوێ، دزێ، جەردەیێ، کەم دەستێ، لێقەوماوێکدا وەستابا، لێی داوا نەدەکردەوە. باوت بەگ بوو، تۆ بووی بە پاشا. وەی هەزار لەعنەتی ئاگریت لێ بێ».

پاشا قسەی نەکرد. هەر هێندەی گوت:

«باڵبەستی بکەن، کۆتێکی گرانی لە ستۆ کەن و لەزیندانێی هاوێن».

گوندێکی زۆر لە داوێن و لاپاڵەکانی ئاگری بوون. مەحموود خان بە خۆی و بەگە کوردەکان و پیاوەکانیان، بە لەشکرێکی گەورە و گرانەوە، گوند بە گوند گەڕان. هەر گوندێکی دەچوونێ چۆڵ و هۆڵ بوو دەتگوت پێی زیندەوەرێکی نەکەوتووەتێ. پاشا هەرچەندی گوندی چۆڵ و هۆڵ پتر دەدیت، هێندەی دیکە



حاڵی سۆفی لە زیندان

هار دەبوو و هەڵدەچوو، دەیگوت:

ئالای یاغیبوونیان هەڵکردووە.

پاشا یەکجار کەڵەگەت بوو، کەپۆی قوڵینگانە هەڵکەوتبوو، چاوی ڕەش، ڕدێنی ڕەش و لوول بوو. لە هەموو حاڵێکیدا، لە هەموو ڕەفتار و هەڵس و کەوتێکیدا، لە دەست براوتندا، لە ئاخاوتندا، بەخۆوەنازینێکی خەست و خۆڵی لێ هەڵدەڕژا. زۆر کەمدوو بوو. هەمیشە بیری دەکردەوە. بە شاقاوی بەرین، بەرین هەنگاوی هەڵدێناوە و زۆر بە سام و هەیبەت بوو. هەمیشە لە ژێر کوڵکە سمۆرەکەیدا ئارەقەی دەکردەوە. لە پێدەشتی ئیغدیرەوە چووە زۆزانی ئاخوری. ئەو هەموو ڕێگاوبانەیان بڕی، چما تووشی شوانێ، گاوانێ، ڕێبوارێ، ڕێگرێ بوون. بۆچی پەلەوەرێک، ورچێک، ڕێوییەک، پڵینگێک، جانەوەرێکیان تووش هات؟ دەتگوت ئەو دەمەیە کە تازە دنیا ڕۆنرابوو. مێشی مێش ئاسایی وزەی لێوە نەدەهات. پاشا گوتی:

«بۆ کوێ دەچن، هەر دەیاندۆزمەوە، لە بن ئەرزبن، پەیدایان دەکەم. گەیشتبنە ئەو پەڕی دنیا، بۆ ئێران، بۆ هیندستان، بۆ چین و ماچین، بۆ پشت قوللەی قاف چووبن، دەیانبینمەوە».

بەگە کوردەکان متەقیان نەکرد، دەتگوت زمانیان بڕابوو.

زستان بەسەری دادان. ئەسپەکانیان، خۆیان، قۆشەنی گەورە و گرانیان هەموو ماندوو و شەکەت بووبوون. هەموو ئاگرییان کون کون پشکنیبوو، گەیشتبوونە بن ئاگریی بچووک. پاشا ڕەنگی پێ نەمابوو، بەجارێ حاڵی شڕ بووبوو. لەوەی کە تووشی هیچ زیندەوەرێک نەدەهاتن پەست بووبوو و هەر هێندەی مابوو شێت و هار نەبێ، ئیدی لەگەڵ کەسدا لێوی لەبەر یەک هەڵنەدەهێناوە و کەس ورتەی لێ نەدەبیست. دەستە و دایەرەکەی دەوروبەری مەگەر بە هەڵس و کەوت و ڕەفتاریدا، دەنا بە قسە هیچیان لێ هەڵنەدەکراند. بێ پشوو لەو نێوە بە ناهومێدی دەخولاوە.

یەک لە بەگە کوردەکان کە نێوی مەلا کەریم بوو، بەرەو پاشا چوو، گوتی:



پاشا تووڕە بوو، گوتی: «دەردی من ئەحمەد
نییە، ئەسپ نییە»

«پاشام، ئێمە لەم چیای ئاگرییەدا هەزار ساڵی دیکەش بخولێینەوە تووشی کەسێکی نابین. ئەم چیاییيانە وا خۆیان دەشێرنەوە، شەیتان بە شەیتانی خۆی ڕێیان پێ نابا»

پاشا بەو هەموو خەم و خەفەتەوەی کە لە چاویدا قەتیس مابوو نۆڕییە مەلا کەریم، بەڵام هیچی نەگوت.

کون و کەلێنی ئاگرییان هەموو پشکنی. پاشا لە دڵی خۆیدا، دەیگوت جگە لە سۆفی چیاییيەکی دیکەم وەچنگ کەوتبا چیی دیکەم نەدەویست. بەگە کوردەکان لە نێو خۆیاندا کۆبوونەوە، ئەم کارە بە چ ئاکامێ دەگەیشت. هەر بخولێوە، بخولێوە، ئەنجام؟ ئاکام؟

ئێ خۆ پاشاش لە هیچ حاڵی نابێ. ئەو هەر هێندە دەزانێ لە چۆڵ و هۆڵی گوندەکان پەست و تووڕە بێ و هیچی دیکە. قابیلە هەتا هەتایە هەر خولایانەوە. لەوانە بوو فەرتەنەیەک، وەیشوومەیەک هەڵی کردبا، هێندەی چاوبقوچێنی و بیکەیەوە هەمووی تێ بردبان. ئەمانەیان هەموو ورد و باریک بە پاشا ڕاگەیاندبوو، پاشا گوێی نەدابوونێ. ئیدی بە دوور و درێژی قسەیان کرد. بڕیاری خۆیان ڕۆنا کە بە پاشای ڕابگەیەنن.

مەلا کەریم چووە پێشێ لە خزمەت پاشا دەستەوسینە ڕاوەستا، بڕیارەکەی ڕاگەیاندێ، گوتی:

«پاشام، ئێمە کۆبووینەوە و بڕیاری خۆمان دا، گفت و بەڵێنی پیاوان بێ، چوار مانگی دیکە، هەر لەگەڵ بەهارێمان بەڕێ کرد گوێی ئەسپەکەش و ئەحمەدیشت لە مستی مبارەک نێین».

پاشا گوتی:

«خەم و خەفەتی من ئەحمەد نییە، ئەسپ نییە. من نازانم ئەم هەموو چیاییيانە چییان لێ هات، کوێوە چوون؟ جگە لە سۆفی کەسی دیکەمان نەدیت. مێروولەیەکمان چاو پێ نەکەوت. بەر لە بەهار، پێش بەفر چوونەوە کوندییەکانیشم دەوێن».

بەگـە کوردەکـان دیسـان کۆبوونـەوە. بە دوور و درێژی ڕاوێژیان کـرد. مـەلا کەریم دیسان گەڕایەوە حوزووری پاشا، گوتی:

«چاکـە، گـەورەم، هـەر لەگـەڵ داهاتنی بـەهاردا گـوندییـەکانـیشت بـۆ پەیدا دەکەین. لە بنی دنیابن دەیاندۆزینەوە».

ئەوجـا هـەمـوو گـەڕانـەوە کۆشـک و سـەرایێ. پاشـا بەگـەکـانی بانگ کـردە دیومخان، یەکە یەکەی خەڵات کردن. بەگەکان زۆریان شـانازی بەو کردەوانەی پاشـاوە کرد. بەڵام ئـەحـمـەدیان چۆن وەگیر کـەوێ؟ ئەم چیـاییـانە بیـانەوێ تا دنیـا خـرا دەبـێ خـۆ وەدەسـتـەوە نادەن. پاشـا پیـاوێکی زۆر خـوێندەوار بـوو. پێوەندیی بە عوسـمـانلی و شـان و شکۆی عـوسمـانلییـەوە زۆر توند و تۆڵ بوو. باپیری بـاپیریشـی هـەر لە تیرەی ئەم چیـاییـانە بوو. نەیدەزانی لەکەیەوە لە چیا هـاتووەتە خـوار، ئەو هـەر هێندەی دەزانی کە باوی پاش ئەوەی لە فێرگەی «ئەرزەڕۆم» دەرچـووبوو، چووبووە ئـەسـتـەمـبـووڵـێ و لە بارەگـای پادشـایان دەرووی کـاری خـێـری لە ڕوو کـرابووەوە و لەوێوە یەکـسـەر بـە پادشـایەتی ناردرابووە ئێـرە. باوی پیـاوێکی کـەڵەمـێـردی گـەڕنـاس بوو. هـەر دەتگوت خـەرتەلە. ئەم کـۆشـک و سـەرایەی شـاری بایزید ئەو لەسـەر ئەم کەمـەرکـاج و بەردە رەقانەی رۆنابوو. مـەلای بەناوبانگ، گۆرانیبێژ و خۆشخوان و شـاعیری چاک لە خـۆ کـۆ دەکـاتەوە. لە ئـەرزەڕۆمـەوە تا قـارس، لە قـارسـەوە تا وان، چۆکی بە هـەمـوو ئاغا و بەگی کوردان دادابـوون. باوی زۆر ژیا بوو. تا ئاخـرو ئۆخری ژیانیشـی لەسەر پشتی ئەسپان پیادە نەبـووبوو. کە هاوینان دادەهات دەچووە زۆزانەکانی چیای ئاگری، خێـوەتی خـۆی لە ڕاسـتـانێک هەڵدەدا و بە هەزار کۆشک و تەلاری بایزیدی نەدەگۆڕییـەوە. لە ڕاسـتـانێـک هەڵی دەدا کە پشتی بە سەهۆڵبەندانەوە بوو. چیاییەکان زۆریان ڕێز لێ دەگرت. ڕەنگە لە ترسان ... ئەویش زۆری ڕێز لە چیاییەکان دەنا. بەپێی داو و دەستووری وان هەڵدەستا و دادەنیشت. مـەحمـوودخـان ئەوەی لە بیر مابوو کە باوی چۆن چل پەنجا بلوێرژەنی لە خێوەتەکەیدا کۆدەکردنەوە و بلوێری پێ دەژەنین.

ئەگـەر ئەسپێکی باوی هـەڵاتبا و چووبا بەر دەرکی مـاڵی یـەکێکی ئەحـمـەد

ئاسایی وەستابا، داخۆ ئەسپەکەیان دەداوە؟ ئەگەر نەیاندابا‌وە ئاخۆ چی دەکرد؟ مەحموودخان هەرچەند بیری دەکردەوە، وەڵامی خۆی پێ نەدەدراوە.

ئەم بەگانە چیاییـیەکانیان چۆن پێ دەدۆزرێتەوە؟ ئەگەر زۆر دوور کەوتبنەوە، بۆ ئێران، بۆ خۆراسان چووبن؟ پەنایان بۆ چیاکانی قەفقاس بردبێ؟ چۆن دەتوانن، پەیدایان کەن؟

پاشاش وەکو باوی لە پێشان لە ئەرزەرۆمی خوێندبوو، پاشان چووبووە ئەستەمبووڵێ، لە بارەگای پادشایان دەرووی خێری لێ کرابووەوە و لەوێ وەبەر چاوان کەوتبوو. لەگەڵ لەشکری پادشادا تێکەڵ بە شەڕ و شۆڕان بووبوو، بوێری و گەڕناسیی خۆی نواندبوو، بەچاونەترسی و جەرگ قایمی ناوبانگی دەرکردبوو. شارەزای شام و حەڵەب و قاهیرە بوو، ماوەیەک لەوانە ژیا بوو. سۆفیا و دەلی ئورمانیش شارەزا بوو. خاوەر و خۆرئاوای ئەمسەر و ئەو سەر کردبوو. دوازدە ساڵ پێش مردنی باوی هاتبووە ئێرە بۆ بایزید، بۆ ئەم کۆشک و سەرایە. کە باوی دەمرێ لە جێی وی دەبێ بە پاشا. وەختی خۆی باوی لە دووی ناردبوو، دەنا لە ئەستەمبووڵ وەدەرنەدەکەوت.

لە پێشدا لەگەڵ ئەم ئینسانە کێوییانە، لەگەڵ ئەم چیاییانە نەگونجا. کۆشک و سەراکەی لە شاری ئەستەمبووڵیش، هاوتای نەبوو. بەڵام کار بە کۆشک و سەرا پێک نایەت، هەرچی ژنی ئەم چیایانە بوون زۆر شۆخ و جوان بوون. لە هیچ سووچێکی ئەم دنیا پان و بەرینەدا ژنی وا ناسک و تەنک و نازدار و نەشمیلانە نەبوون. پێشان کیژە ئەرمەنییەکی خواست. پاشان کیژی بەگێکی کوردی هێنا. ژنی سێیەمی لە قەفقاس مارەکرد. ژنی چوارەمی خەڵکی کەناری گۆلی ورمێ بوو. سێ کچ و هەشت کوری بوون. پێنج برای هەبوون. خزم و کەس و کاری هۆزەکەی لە دەشتی ئیغدیر بوون. پێوەندی و سەر و ساختێکی ئەوتۆی لەگەڵیان نەمابوو. نەختێ بە چاوی نزمی تەماشا دەکردن. برا چکۆلەی کۆشک و سەرای بایزیدی بەجێ هێشتبوو، گەڕابووەوە بۆ دەشتی ئیغدیر، کیژێکی لە هۆزەکەی خۆی خواستبوو، لەگەڵیان مابووەوە و جارێکی دیکە نەگەڕابووەوە کۆشک و سەرای بایزید. زۆری رک لە براکەی

بوو. پاشـا ڕاوی زۆر مـەراق بوو، ئەویش ڕاوە مـامـز و بەس. هەر کـە بەهار دەهات کیـهـە چێترین تاژی بـوون کۆی دەکردنەوە، دەچووە چیای ئەسرووک بەسـەر گۆلی وانـەوە، دەچووە دۆڵی سـۆڕێ، بۆ دۆڵی زیل، بۆ چیـای سـوبحـان لەوانە ڕاوی دەکرد، بە سەدان کەوڵە مامزی دێناوە.

کـچەکـانی پاشـا یـەکیـان نێوی گـوڵستـان، ئەوی دیکەیان نێوی گـوڵڕێز، سێیەمیان نێوی گوڵبەهار بوو. گوڵستانیان لە ژنە ئەرمەنییەکەی بوو. چاوی کـەش و شـەهلا بوو. پۆرسـوور و بژۆل درێژ و بـەژن زراو و کـەڵەگـەت بوو. بەرگی لە ئەستەمبووڵەوە بۆ دەهات... وەکو ئی کۆشک و تەلارانی لەبەر دەکرد. هەرچی گوڵڕێزیان بوو مەیلەو قژکاڵ بوو، گەردنی وەکو گەردنی قوو درێژ بوو. بژۆلی لوول بوو. چاوی شین بوو. ئەویش هەر وەکو گوڵستانی خوشکی بەرگی ئەستەمبووڵییانەی لەبەر دەکرد. گوڵڕێز خوێندنی زۆر مەراق بوو. مەم و زینی ئەحـمـەدی خـانیی سـەرلەبەر بە ڕەوانـی لەبەر بوو. دەهـاتە دیوەخـانی باوی شـیـعـری بـۆ دەخـوێندەوە. باوی گـوڵڕێزی لە هـەمـوو منداڵەکـانی خـۆشـتـر دەویست. گوڵبەهاریان بەژن نێوەنجییەکی شل و ملی نەشمیلانەی گەنم ڕەنگ بوو. پۆست مـشـتـومـاڵ و بـێ گـەرد بـوو. لە زۆر سـەرەوە لە خـوشکەکـانی نەدەچوو. جل و بەرگی نەخشراوی وەکو ژنە ئاگرییاییەکانی لەبەردەکرد، جل کەزیی بەردەداوە. ملوانکەکەی زێڕ بوو. وەکو ژنە ئاگرییاییـەکان خرخاڵی زێڕ و مرواری و زومرووتی لە پـێ دەکرد. زۆر زیرەک بوو. کەمـی قسە دەکرد، زۆر ناسک و نازدار پێ دەکـەنی. خـوشک و براکـانی زۆر کـەم لە کـۆشک وەدەردەکەوتن، بەڵام گـوڵبـەهار وا نەبوو. ئەو هەمـیشـە لەگەڵ خـەڵکدا تێکەڵ بوو. لە شـایی و شینیان دووا نەدەکەوت، هەمیشە بەدەمیانەوە دەچوو.

خـەڵکی شـاری بـایزید، گـوندییـەکـانی ئاگـری گـوڵبـەهاریـان زۆر خـۆش دەویست، بە چاوی نێرینەیەکی هـەڵکەوتووەوە دەیاننۆڕیێ. لە هەر کـوێیـەکی نەخۆشێک، یەکێکی دەستەوسان، پیرێکی کەنەفت هەبا، یەکسەر بەدەنگییەوە دەچوو. لە سوارچاکێ سـوارچاکتر سواری ئەسپان دەبوو. پاشـا دوراو دوور، بێ ئەوەی خـۆی لە ڕەفتـاری هەڵقـورتێنێ، چاودێریی دەکرد و لە دڵی خـۆیدا

دەیگوت: ئەم کیژە پیاویا دەبوو بە پادشای ئاگری.

گوڵبەهار هیچ خۆشی بە کۆشک و سەرادا نەدەهاتەوە. لەگەڵ براکانیشی سەروساختی زۆر خۆش نەبوو و لەگەڵ یەک نەدەسازان. گوندییەکان قەتیان بە نێوی خۆیەوە نێو نەدەهێنا، پێیان دەگوت کیژە گوڵ بەدەمەکە.

کە پێ دەکەنی هەر دوو سەر گۆنای چاڵ دەبوو. چاوە پڕ تینە خەماوییەکەی بە حەسرەتێکی دوورەوە دەسووتان. تازە پێی لە بیست ساڵ نابوو.

ئەوەی لە هەموو کەسێ پتر بە مەراقی مەسەلەی ئەسپەکەی باویەوە دەتلاوە گوڵبەهار بوو. شتێکی لەبارەی ئەم ئەسپەوە دەزانی، بەسەرهاتەکەی لە سۆفی بیستبوو.

سۆفیی زۆر خۆش دەویست. هەموو ڕۆژێ بە دەستی خۆی خواردنی بۆ دێنا زیندانێ و پەیتا پەیتا پرسیاری سەیر سەیری لێ دەکرد.

سۆفیش دەیگوت:

«وەڵڵا کچی خۆم، ڕاستە، من ئەسپەکەم بە چاوی خۆم دیت، ئەحمەد سێ جاری رەها کرد کەچی هەر سێ جارەکەش ڕێ و ڕاست گەڕایەوە بەر دەرکەی ماڵی ئەحمەد. ئەم ئەسپە یادگاری ئەحمەدە. خوا بە خەڵات بۆی ناردووە. بە کەسی ناداتەوە. نابێ بیداتەوە. ئەگەر خەڵکی ئاگری هەموو سەریان بچێ ئەو ئەسپە جارێکی دیکە نادەنەوە».

ڕۆژێکیان سۆفی داوای بلوێرێکی لە گوڵبەهار کرد. گوڵبەهاریش خێرا بلوێرێکی کۆنی سەد ساڵەی بۆ هێنا. بەڵام سەری لەم بلوێر داواکردنەی سۆفی سوڕما: سۆفی بەم پیری و تەمەن درێژییەوەی چۆن دەتوانێ بلوێر بژەنێ؟ بلوێرژەنین کاری هەناسە و پیشخواردنەوە و دان بەکارهێنانە. مەگەر لاوی بە گوڕ بتوانن بلوێر بژەنن. گوڵبەهار نواڕی ئەم پیرە بەساڵداچووە، پشت کۆمە هێند جوان و وەستایانە بلوێر بە دەمەوە دەگرێ مەگەر هەر لە ئی وەکو خۆی بێ.



گوڵبەهار گوێ لە بلوێری سۆفی
دەگرێ

سـۆفی هەر کـە بلوێرەکـەی بەدەسـتـەوە گـرت و نەگـرت وەدەنگی هێنا. کوڵبـەهار لەگەڵ گـوێی لە دەنگی پیـرە بلوێر بوو، هەر ئەوەبوو پەڕ و باڵی لێ نەڕوا. لەبەر دەرکی زیندانەکە دانیشت، پشتی بە دیوارەوە دا. سۆفی ژەنی و ئەو گوێی گرت.

هەر کـە بلوێر کـڕ بوو، کـوڵبـەهار وەکـو لە خـەوێکی شـیـرین ڕاپەڕێ وەخەبەرهات. بە دەنگێکی نزم، کە دەبیستراو نەدەبیسترا، پرسی:

«سۆفی ئەوە چ گۆرانییەکە؟»

سۆفی گوتی:

«ئەوە توورەیی چیای ئاگرییـە. ئاگری ڕۆژگاریێ زۆر تـووڕە بووبوو، باو و باپیرانیش ئەم توورەییـیەیان بە گـۆرانی گڕ تێ بەر دەدا و لەو ڕۆژەوە هەر وا دەسـووتێ و دەسـووتێ. کێ دەتوانێ خـۆی لـەبەر بڵـێسـەی گـۆرانـی ئاگـری ڕابگرێ».

کـوڵبـەهار هەمـوو ڕۆژێ پێش ئەوەی خـۆر چاو بەدنیـا هەڵێنـێ، دەهاتە بەر دەرکی زیندان و سـۆفـیش توورەیی ئاگریی بۆ دەژەنی. کوڵبـەهار هەرچەندی لە سـۆفیی دەپرسی ئـەم توورەیییەی ئاگری لە سۆنگەی چییـە؟ سۆفی هیـچی لە بارەوە بـۆ نەدەدرکـاند. هـەر هێندەی دەگـوت: «ئـیـدی تووڕە بووە و هـیـچی دیکە، باو و باپیـــرانیـش ئەم داســـتـــانەیان بـە نـاوی تـوورەیـی ئـەوەوە هۆندووەتەوە. من داسـتـانەکە تـەنیـا بە زمـانی بلوێر دەزانم بگێڕمـەوە، بەڵام ئەوانەی بە زمـانی مـرۆ دەیگێڕنـەوە خـۆشـخـوان و دەنگبـێژن، من هـەر بلوێر ئەنگێوم، دەنگبێژ نیم».

کوڵبـەهار هـەرچەندی کرد هیـچی لە بارەی بەسـەرهـاتی توورەیی ئاگرییەوە لە سۆفی وەچەنگ نەکەوت.

سۆفی دەیگوت:

«هەی هەشـم بەسـەر، بلوێری من تـوورەیی ئاگـریت حـاڵی نـەکـا، ئەی چی حاڵیت دەکا؟ یا من زۆر پیر بووم».

گوڵبەهار ئەم گۆرانییە بەناوبانگەی لەو چیا و چۆڵانە زۆر لە ژنان، لە منداڵان، لە دەنگبێژان، لە بلوێرژەنان بیستبوو، بەڵام قەتی وەکو ئەوەی سۆفی لە کەس گوێ لێ نەبووبوو. ئەگەر ئەم توورەیییەی بە زمان گێڕاباوە داخۆ چی گوتبا و چیی هەڵڕشتبا؟

پاشا دونگەی ئەوەی کردبوو کە گوڵبەهاری کچی پێوەندیی لەگەڵ سۆفیی کۆت لە ملی زیندانێ هەیە و هەموو ڕۆژێ خۆراکی بۆ دەبا و گوێ لە ئاوازی بلوێرەکەی دەگرێ.

ڕۆژێکیان سۆفیی بۆ دیوەخان بانگ کرد، گوتی:

«تا ئەسپەکەم نەگەڕێتەوە، ئەحمەد نەیەتەوە ئازادت ناکەم، حەز دەکەی بڕۆ، ئەسپەکە و ئەحمەدم بۆ بێنەوە».

سۆفی لێی زیت بووەوە، گوتی:

«نە ئەسپ دەگەڕێتەوە، نە ئەحمەد. ئەسپەکە خەڵاتە و خوا داوێتییە. ڕەنگە ئەحمەد بێتەوە، بەڵام ئەسپەکە ناگەڕێتەوە. منیش ئەحمەدت بۆ ناهێنمەوە. پاشا زۆر توورە بوو. سۆفیی ڕێ و ڕاست گەڕاندەوە نێو زیندان.

گوڵبەهاری بۆ کن خۆی بانگ کرد، گوتی:

«واز لەم سۆفییە بێنە»

پاشا قسەی یەک بوو، نەدەبوو بە دوو.

پاش چەند ڕۆژێ بەگی هۆزی حەیدەران خەبەری نارد کە: «پاشا خەمی نەبێ و نەکەوێتە مەراقەوە، جێگەی ئەحمەدیش و ئەسپەکەش و چیاییەکانیشمان دیتەوە، هەر بەو زووانە گوێی ئەحمەد و جڵەوی ئەسپەکەی لە مست دەنێین».

ئەحمەد هەموو چیاییەکانی لە خۆی خڕ کردبووەوە، بەرمخوار تا نێو کوردەکانی شەمزینان و چیاکانی هەکاری چووبوو.

بەگەکان هەموو کۆبوونەوە، کوڕی بەگی میلانیان بە بارمتە بۆ شەمزینان

نارد. مـوسـابەگی کـوڕی بەگی مـیـلان ئەحـمـەدی لە سـینگی چیـایەک، لە خێوەتێکی نەخشین و مۆردا، کە لە نێوان سەدان خێوەتدا هەڵدرابوو، چاوپێ کەوت. ئەحمەد زۆر بە گەرم و گوڕی پێشوازیی موسابەگی کرد. موسابەگ: حـاڵ لەمە، حـیکایەت لەوە مەسەلەکەی بۆ ئەحـمـەد گێڕایەوە، گـوتی: «پاشـا دەیەوێ بتبینێ، لە خۆت زیاتر کەسی دیکەی ناوێ. ئەسـپەکەشی ناوێتەوە. پاشـا دەیەوێ گوندییەکان بگەڕێنەوە ئاگری. پاشـا لەبەر خـاتری بەگەکـان لە خۆشت و گـوندییـەکـانیش خۆش بووە. بەڵام بینینی تۆی زۆر بەلاوە مـەراقـە. دەڵێ: ئەم ئەحـمـەدە ئاخۆ چـتۆ پیـاوێ بێ. خـوا دەکا من دلێرێکی وا دەبینم، ئەوسـا نـەک ئەسـپێک پێنجی دیکەشی خـەڵات دەکـەم. دەبا جـارێ چاوم بە کەڵەمێردێکی وا ڕوون کـەمـەوە. بەگـەکان ڕایان سـپاردووم پێت ڕاگـەیەنم».

بەگەکانی شـەمزینان، گەورە و دەمڕاستی ئاگری، بەگـەکـانی، ئاغاکانی هەموو کۆبوونەوە، بە دوور و درێژی قسـەیان کرد. هەندێ دەیگوت: ئەمە داو و تەڵەکەیە، هەندێ دەیگوت: «قابیلە ئەم هەمـوو خـەرتەلە بەگە هێند ئاڵچاخ و هیچ و پووچ بن و خـۆیان بـە داو و دەهۆ بۆسـۆ و سـووک کەن؟» تۆ بڵێی کەڵە پاشـایەکی عوسـمانلی و ئەم هەموو بەگە کوردە بۆ ئەسپێک خۆیان سـووک و ڕیسـوا کەن؟ کـەواتا پاشـا دەیویست ئەحـمـەد ببـینێ. ئەو دەیگوت: من هەر هێندەم دەوێ بزانم ئەسپەکەم لە پێش دەرکەی کێ وەستاوە.

ئەحـمـەد لە زیندان هاویـشـتنی سۆفـیشـی لە مووسـا بەگ بیسـتەوە. زۆری بەزەیی پێدا هاتەوە.

کاتێ لە ئاگری کشانـەوە، چەندی لێ پاڕاوە سۆفی بۆ لە چیا هەڵنەکەندرا. وەکو گاشـە بەردێکی زەلام خۆی بە سـینگی چیاوە نووسـاندوو لەوێ مایەوە. چوزانێ پاشا لە زیندانێی داوێ.

موسـابەگ گوتی:

«خەمتان نەبێ، سۆفی کاری زۆر سازە».

ئەوەی بۆ گێڕانەوە کە چۆن گوڵبەهار دۆستـایەتیی لەگەڵ سـۆفـیدا بنیات

ناوه، خەڵکەکە زۆریان پێ خۆش بوو.

ئەحمەد گوتی:

«موسا بەگ، مادامێکی جەنابت هاتووی، خاتری تۆ بێ و قسەت ناشکێنم. چاکە دەگەڕێمەوە ئاگری، دیدەنیی پاشا دەکەم، هۆزیش هەموو دەگەڕێنەوە.

بەڵام پاشا جارێکی دیکە چاوی بە ئەسپەکەی ناکەوێتەوە».

مووسا بەگ قسەی خۆی دووپات کردەوە، گوتی:

«پاشا تەنیا خۆتی دەوێ و بەس. هەر خۆتی دەوێ».

لە ڕۆژێکی خۆشی بەهاریدا، چیاییەکان گەڕانەوە ئاگری.

بەگە کوردەکان ئەحمەدیان بۆ کۆشک و سەرای پاشا برد. پاشا بێ تووڕەبوون ئەحمەدی تۆزێ بەتەوس و لووت بەرزییەکەوە پێشوازی کرد، گوتی:

«وەرە، بزانم سوڵتانی ئاگری، ئەسپەکەم لە کوێیە؟»

ئەحمەد گوتی:

«ئەسپ لە ماڵییە».

پاشا بە پێکەنینەوە:

«تۆ ئەسپەکەت دزیوم، دەزانی ئەسپ دزینی پاشا سزای چییە؟»

ئەحمەد بێ پەروا گوتی:

«من ئەسپی تۆم نەدزیوە. ئەسپم لەلایەن خواوە بە خەڵات و یادگار بۆ هاتووە. ئەسپ نادرێتەوە. خۆ تۆ خۆشت لە تیرەی ئێمەی و چیاییت، چما نازانی ئەمە تۆرەیە و هەزاران ساڵە باو و باپیران لە سەری دەڕۆن؟»

پاشا کە ئەمەی بیست لە ڕکان چاوی پەڕییە تۆقی سەری، قیژاندی: «نەخێر نازانم، یا ئەسپەکەم، یا سەرت، بیبەن لە زیندانێی هاوێن». ورتە لە دەمی هیچ یەکێ لە بەگە کوردەکانەوە نەهات.

کاتێکی ئەحمەدیان بۆ زیندان دەبرد، نەڕاندی:

«پاشا، پاشا، گوێت لێ بێ، سا بە هەرچی پیری ئاگری هەیە، سەرم دەدەم بەڵام جارێکی دیکە چاوت بەو ئەسپە ناکەوێتەوە و لەبەر کۆشک و سەراکەتدا نایبینیتەوە».

مووسا بەگ وای چاوەنۆڕ نەبوو، گوتی:

«پاشا، ئەوەی ئێوە دەیکەن کردەوەی ئینسانان نییە. ئەحمەد من هێنام. من بۆیەم نەهێنا لە زیندانێی ئاوێی. درۆت لەگەڵ کردین، فریوت داین، پاشا».

پاشا ڕاچەنی، گوتی:

«ئەمیش زیندان کەن».

مووسا بەگیشیان زیندان کرد.

ئەنجا پاشا ڕووی لە بەگەکان کرد گوتی:

«ئاواتان کۆمەک کردم؟ کوا ئەسپەکەم؟ ئەحمەدم بە دەست کەوت ئەی ئەسپەکەم؟» ئەسپەکەم دەوێتەوە ئەسپەکەم، پەڵەی وا بە نێو چاوانی بنەماڵەمەوە نانێم. جا نۆرەی ئەوەمە بڵێن: پاشا نەیتوانی ئەسپەکەی لە چیاییەک بستێنێتەوە».

بەگەکان گوتیان:

«کارێکی سانا نییە، بەڵام ئەسپیش دێنینەوە».

بەسەرهاتی ئەسپ و ئەحمەد و موسا بەگ بوو بە داستان و لە وانەوە تا مەڵاتیە، قەفقاز، لەوێشڕا بە عەنەدۆڵ و شوێنانی دیکەدا بڵاو بووەوە و کەوتە سەرزاری ورد و درشت. شایەر و بەیتبێژان سەدان بەیت و گۆرانییان لەسەر ئەسپەکە و ئەحمەد هۆندەوە.

چیاییەکان ئەم داو و تەڵەکەیەیان زۆر لە شان گران بوو، هۆزی میلانی زۆر پێ تووڕە بوو.

موسا بەگ هەرکە گەیشتە زیندان پەلاماری دەستی ئەحمەدی دا، گوتی:

«بمبووره، ئەحمەد من كردم، تۆ نەیكەی، نەمزانی دمنا چۆنم دەهێنای، تا سەری خۆم وەستابێ، سەری تۆ نادرێ».

سۆفی زۆری كەیف بە هاتنی ئەحمەد هاتەوە. باوەشی پێدا كرد، ماچی كرد. ئەنجا بلوێرەكەی بەدەمەوە نا، دەستی بە تووڕەیی ژمنینی ئاگری كرد، هەر ژەندی و ژەندی، فرمێسك بە چاوی ئەحمەد و موسا بەگدا هاتە خوار. دوور و درێژی ژەند. پاشان بلوێرەكەی دا بە ئەحمەدی. ئەحمەد بە جارێ هەناوی ئاگری گرتبوو. گوتی هەی هەزار لەعنەتی ئاگری لە پاشاش و لە بەگەكانیش بێ، دەستی بە بلوێر لێدانێ كرد. پیرە بلوێر بە ڕەنگێكی تر، بە دەنگێكی دیكە هاتە زمان. ئەم دەنگە تازەیە بەر گوێی گوڵبەهار كەوت. زۆر جیاواز بوو. ئەم دەنگەش هەر تووڕەیی ئاگری دەگێڕاوە. بەڵام دار و بەردی وەجۆش و خرۆش دەهێنا، شاخ و كێوی دەلەرزاند.

گوڵبەهار ڕێ و ڕاست هات بۆ زیندان. لە باوی زۆر دەترسا. بەڵام گوێی نەدایە هیچ و گوتی: چ دەبێ با ببێ، دەبوو ئەم بلوێرئەنگێوە تازەیە ببینێ. بە بیانووی سۆفییەوە چاوی بە ئەحمەد كەوت. هەر لە خۆڕا هەستی بە سۆزێكی گەرم و دۆستانەی ئەحمەد كرد. بەجارێ لە كردەوە دزێوەكانی باوی شێت و هار بوو. لە پەنا دیواری زیندان دانیشت، گوێی لە بلوێرەكەی ئەحمەد گرت. بووڕایەوە. دەبوو كارێك بە ئەنجام بگەیەنێ. بۆ داپۆشینی كردارە نائینسانانەكەی باوكی دەبوو شتێك بكا. بوێریی موسا بەگی زۆر پەسند كردبوو.

ئەوێ ڕۆژێ لەگەڵ ئەو ژنانەی كە زۆریان خۆش دەویست چوونە متبەقێ، خواردنێكی زۆر و زەوەندی خۆشیان بۆ زیندانییان دروست كرد. بە پاكار و نۆكەراندا بۆ زیندانیان نارد، دایكی بەمەی زانی، گوتی:

«كیژێ، پاشا بەمە بزانێ لە سەری هەموومان دەدا».

گوڵبەهار گوتی:

«پاش ئەو هەموو ڕیسوابوونە، پاشا چ دەكا، بكا، باكم پێ نییە».

ڕۆژگارێکی زۆر بەسەر چوو، بەگە کوردەکان نەتوانییان ئەسپەکە بدۆزنەوە و نەتوانیشیان خەبەرێ بۆ پاشا بنێرن.

موسا بەگ و ئەحمەدیش لە کونی زیندانێ توند کرابوون. گوڵبەهار هەمیشنە بە دزییەوە خواردنی خۆشی بۆ دەناردن. ناوبەناویش دەچووە زیندان بە سەری دەکردنەوە.

ڕۆژێکیان دەری نەبرد، گوتیە سۆفی:

«دەمەوێ لەگەڵ ئەحمەد باخێوم، پێی ڕاگەیەنە شەوێ دێمە زیندانێ».

ئەحمەد ڕدێنێکی مووڵووڵی زەردی زێڕینی درێژی بەردابووەوە. بژۆڵەکانی خەم و کەسەرێکی قووڵی بە چاوە گەورە شینە سافەکانی دەبەخشی. کەڵەگەتێکی بەژن زراو بوو، قژی لوولە لوولە و پێچ پێچ بەسەر هەنیەیدا شەپۆلی دەدا. دەم و چاوە درێژکۆڵە ناسکۆڵەکەی، دەم و چاوی کەڵە کێوییەکی برینداری خەماویی وەبیر دێناوە.

وەکو خەون ببینێ، یا بە خولیایەکەوە گلابێ بەو ڕەنگە بوو. ڕوخساری لە پشت تەم و مژی ڕووناکییەکەوە بوو، دەتگوت داخی دڵی ئاگری بە کۆڵەوە گرتووە، هەڵوێست و نیگای تامێکی لێ دەهات خوێنی پیاوی وەجۆش دەهێنا و گری بۆ نێو کوورەی دنیایەکی کەسنەزانی دووری نەناس و نامۆ دەبرد. گوڵبەهار وەکو ئەحمەدی زۆر لە مێژتر ناسیبێ وابوو، هەر وەکو پێکەوە لە دایک بووبن و بەیەکەوە ژیابن وابوو. زۆری هەست بە ئاشنایەتی دەکرد. کێ دەزانی؟ لە شایی و کۆڕان، لە زۆزان و پاوانان، لە زەماوەندان، لە بندارۆک و ڕاو و شکاران نەیدیتبوو. کێ دەیزانی بە خەون نەیدیتبوو، کێ دەیزانی شتێکی، یا نێزیک بە شتێکی وا نەبوو.

سۆفی گوتی:

«ڕۆڵە، چۆن دەبێ، سەرەک وەردییان چۆن قایل دەبێ؟ هاتو پاشا پێی زانی؟ خۆ سەری هەموومان دەپەڕێنێ».

گوڵبەهار، نامەخوا، هەر دەتگوت کێچی دەکەوڵ کەوتووە، ئۆقرە و ئارامی



مەمۆ لە دەرکەی زیندان وەستاوە

لەبەر برابوو. شەوانە چاوی نەدەچووە خەو. دەم و چاوی ئەحمەد وەکو چرایەکی زەرد لە پێش چاوی دەهات و دەچوو. پێ دەکەنی. تاڵترین و ناخۆشترین خەمی لە چاوە شینە درشتەکانیدا قەتیس مابوو. وا پێ دەچوو برینێکی گەورە، دەردێکی ناسۆر و گرانی لە دڵدا بێ. برینێکی ئەوتۆ کە ساڕێژ نەدەبووەوە. هەروەک کەس و کار، دایک و باو، خوشک و برا و دڵداری نەبن وابوو. لەوەدەچوو لەم دنیایەدا تاک و تەنیا بێ. تاک و تەنیا. گوڵبەهار هەرچەند بیری لێ دەکردەوە دڵی پڕ دەبوو لە ژان و ئازارێکی زۆر و لەبەر خۆیەوە پەیتا پەیتا دەیگوت پێویستە بیدوێنم. پێویستە لەگەڵی باخێوم، ببم بە دەرمانی تەنیاییەکەی، مەڵحەمی ئێش و ئازارەکەی. سەرەڕای هەمووشی زیندان کراوە.

بۆچی هەمیشە بیری لێ دەکردەوە؟ بۆچی هەمشە لەبەر چاوی ون نەدەبوو؟ بۆچی لە خەونیدا هەر ئەو بوو و هەر ئەو. ڕووی لەهەر کوێ دەکرد هەر ئەو بوو. دە هەر کەسێک دە هەر چییەک هەڵەنگوتبا، لە پێشدا دەو هەڵدەنگوت و یەکجار شاد دەبوو، بۆ هەر کوێ چووبا دڵی بەرەو زیندانی دەکێشا.

گوڵبەهار چەند جارێکی زیندان دیتبوو. دەرگانەکەی دەرگانە ئاسنێکی قورس بوو. کلیلێکی زنجیرداری زەلامی قورسی هەبوو. کەمەری دەرگاکەی ئەم لاو ئەولاکەی لە بەردی چینکەی شین بوو و بە نەقاری مشتوماڵ کرابوو.

سەرەک وەردییان مەمۆ بوو. باوی گوڵبەهار زۆری شانازیی پێوە دەکرد و هێندەی منداڵەکانی خۆی خۆش دەویست، مەمۆ باوکیشی وەختی خۆی بڕوا پێکراوترین و بوێر و ئازاترین پیاوی دیوانێ بوو. مەمۆ هێشتا منداڵ دەبێ، دووساڵی تەمەن دەبێ، باوی لە شەڕێکدا دەکوژرێ. مەمۆ لاو بوو. زۆر ئازا و دلێر بوو. پیاوێک بوو چاوی لە هیچ نەدەترووکاند و هەر ئەو جۆرە پیاوانەش دەکرێن بە سەرەک وەردییانی زیندانان. کەسی نەدەدواند، کە دواندباشی هێندەی کیژۆڵەیەک شەرم دای دەگرت و ڕەنگی سوور هەڵدەگەڕا. لەوەتی خوا مەمۆی خوڵقاندبوو، قەتی چاو لەبەر گوڵبەهار هەڵنەهێنابوو. سەیری نێوچاوی نەکردبوو. هەر کە دەیبینی ئیدی سوور هەڵدەگەڕا. دەم و لێوی مۆر

دەبووەوە، خوێنی دەرەوییەوە، دەستی دەلەرزی. گوڵبەهار ئەمانەی هەموو بەنیشانەی ئاکاری شەرمنانەی مەمۆ دەزانی. قەتی چاو لەبەر هەڵنەدەبڕی. هەمیشە وەکو کیژێکی شەرمن سوور هەڵدەگەڕا و زۆر کەم قسەی دەکرد.

متبەقی کۆشک و سەرا بە زۆری لە حیسابی زیندان کاری دەکرد و بە دزییەوە خواردنی خۆش و بە تام بۆ مەمۆش دەنێردرا. گوڵبەهار هەموو جارێ دەچووە زیندان بە مەمۆی دەگوت: «کاک مەمۆ ئەم خواردنانەم بە دەستی خۆم بۆ لێناوی».

ماوەیەک ڕۆژگار بەم ڕەنگە بەسەرچوو. گوڵبەهار هەریەک دوو جاری دیکەی - ئەویش لە دوورەوە - چاو بە ئەحمەد کەوتەوە. ئەویش مەگەر بە سایەی مەمۆوە، کە چاوی لە هاتوچۆی گوڵبەهار دەپۆشی و ڕێگای دەدا.

گوڵبەهار بە بیانووی ئەوەوە کە لەسەر پێپلیکانەکان هەموو جارێ لەگەڵ سۆفیدا دەدوا و خۆی خەریک دەکرد، ئەحمەدی لە بن ژێرخانە تاریکەکەی زینداندا دەبینی هاتوچۆی دەکرد، هێندە بە دڵنیاییەوە دەهات و دەچوو، لە هەموو هەنگاو هەڵێنانێکدا هێندە بە سام و نێرانە بوو، دەتگوت کێوە و لە هەڵکەنین نایەت. تیرێژ و ڕووناکی هەریەکە هێندەی لەپی دەستێ لە کونی پەنجەرەی باریک و درێژەوە دەرژایە نێو دڵی زیندانەوە. ژێرخانی زیندان لەسەر هەڵدێرێک ڕۆنرابوو. خوارێ ڕاستان و گۆڕەپانی بایزید بوو. لە ڕاستانەکەوە شارێیەک لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر دەکشا.

ناوبەناو دەنگی زەنگ و قۆڕی کاروان دەگەیشتە زیندانێ و لە نێو داڵان و ژێرخانی سەرهەڵدێرە بە حەواوە هەڵواسراوەکەدا دەنگی دەدایەوە. هەر دەنگ و هەرایەکیش لە چیا و دەشتان ڕادەبوو، ئەوانەش لەو هەڵدێرانەدا دەنگیان دەدایەوە. کڵاوڕۆژنەیەکیش بە قەدەر لەپی دەست پان و بەژنە زەلامێکیش بڵند بە میچی ژێر خانەکەوە بوو و کەس نەبوو بەم کڵاوڕۆژنەیە نەزانێ و بەسەرهاتەکەیان لەبەر نەبێ. جا هەر لەبەر خاتری ئەم کڵاوڕۆژنەیەش بوو کە ورد و درشتی خەڵک سەروەستای زیندانەکەیان بە پیرۆز و تەنانەت، بە خاوەن بەهرە دەزانی. وەستاکە پیاوێکی فەلە دەبێ. لە زینداندا زۆر مابووەوە. کەس

هێندەی ئەو دەرد و مەینەتی و چەرمەسەریی زیندان نەچێشتبوو. ڕۆژێکیان وەبیریدا دێ دەڵێ: «چ دەبێ، با ببێ، وەڵڵا دەبێ کلاوڕۆژنەیەک بۆ نێو ئەم زیندانە بکەمەوە و بۆ یەکەم جار لە دنیادا ڕووناکی لە دڵی زیندان بەردەم، بە مەرجێ واشی بکەمەوە هیچ زۆرداریێک نەتوانێ کون و کەلێنەکانی بگرێ و کوێریان کاتەوە.»

سەروەستا هەر کە لە دروستکردنی قەڵا و زیندان دەبێتەوە نامەیەک بۆ پاشا بەجێ دێڵێ و لە چاوان ون دەبێ. لە نامەکەیدا نووسیبووی: «هەر کەسێ ئەم کلاو ڕۆژنە و کونەباچکانە بگرێ قەڵا و زیندان بە جارێ لە هیم و بنەڕەتڕا دەڕووخێ و نوغرۆ دەبێ».

«ئەمن ئەم زیندانەم لەسەر ئەم کلاوڕۆژنە و کونەباچکانە و پەنجەرە درێژ و باریکانە ڕۆناوە. هەر کەسێ کونەباچکەی ئەم ڕووناکییانەی زیندان کوێرەوەکا، یەکسەر هەزار بەڵای ناگەهانی بەسەردا دەڕژێ و ببڕای ببڕای نە نەوەی نەنەوەی نەوەی لە پاشەڕۆژدا خێر لە خۆی نابینێ. هەر کەسێکیش ئەم نامەیەم بۆ بە خەڵکی کۆشک و سەرا ڕانەگەیەنێ ئەویش ڕەگ و ڕیشەی دەپووکێتەوە و ئاسەواری دەبڕێتەوە.»

لەوەتی ئەو کلاوڕۆژنە و کونەباچکانە دروست کرابوون کەس نەیدەوێرا توخونیان کەوێ. جا بۆیەش بوو کە زیندانی سەرای بایزیدێ بووبووە بنێشتە خۆشەی سەر زاری چووک و گەوران. هەر گیراوێک چوویا زیندان دووعای خێری بۆ وەستا سلێمانی فەلە دەکرد.

کە لەو کون و کونەباچکانەوە سەیری دەرێت دەکرد، زستان با، هاوین با، دنیا دنیایەکی دیکە بوو. ڕێگا و بانی بەرەو ئاسمان هەڵکشاوی باڵگرتوو، تەیر و توو، بەفر و بەستەڵەک، کاروانی و ڕێبواران، پۆڕ و چێرگ، مراوی و قاز و قولینگ، خەرمانە ستێری گەش گەشی بە جریوە جریو هەر دەتگوت بەسەر لووتکە و تەپۆڵکاندا داکوتراون. ئەستێران شەوانە جریوە جریویان بوو و لەو نێو گوڵ و جۆگانەدا بە هەزار چەشنە خۆیان دەنواند و ئەو دەورووبەرە دەبوو بە سێ ڕیزەوە و لە نێوان هەر ڕیزێکدا وەکو چراخانێک بەرەو ئاسمان

باڵ بگرێتەوە بەو ڕەنگە بوو. ئەوانەی لە زیندان وەدەردەکەوتن جارێکی دیکە چاویان بەو ڕەنگ و دیمەنە ڕەنگاوڕەنگانە نەدەکەوتەوە کە لە کونەباچکانەوە دەیاندیتن. دیمەنەکان یەکجار سەیر بوون: گولیلکی سەد تەرزە، بەفر و بەستەڵەک، ڕووناکی، شینایی هەندێ مۆر، هەندێ وەنەوشەیی، هەندێ سوورێکی تێر، هەندێ زەرد، هەندێ شین، هەندێ ترنجی، ئیدی لە هەمە ڕەنگە دەچریسکانەوە و هەر جارە بە تەرزێ دەگۆڕان و خۆیان دەنواند. هەر کە زیندانییان لە زیندانێ وەدەرکەوتن ئەو دنیایەش، ئەو دەشت و دەرە سەد تەرز و دیمەنەش سەری خۆی هەڵدەگرت و کەس نەیدەزانی بۆ کوێ دەچوو.

سۆفی، ئەحمەد، موسا بەگ ئەوانیش بەش بە حاڵی خۆیان زۆریان لەو کونانەوە سەیری ئەو بەهارە کۆچ لەبەرە سەرهەڵگرتووەی دەکرد. سبەینان تەم و مژێکی سەیر لەو پێدەشتەوە ڕادەبوو. گردۆڵکە و زوورگ و هەڵەت تەپە و تەلانی بە تارایەکی بە هاستەم شین دادەپۆشی و وردە وردە بەرەو پەمبەیی ڕەنگی دەگۆڕا و پاشان دەسڕایەوە.

گوڵبەهار سەرتاپا غەرقی دڵداری بووبوو تا مۆخی نێو هێسکانی پڕ بووبوو لە ئەوین. هەرچی بەردەست کەوتبا، گیان لەبەر با، یا بێ گیان، پشکۆیەکی ئەوین بوو و پێیدا دەچزا. گوڵبەهار وەکو بەنگییەکی بە ئەوین کاس و گێژ بێ پشوو، شەو و ڕۆژ دەخولایەوە و جێگای بە خۆی نەدەگرت. جارێ لە دەریای ئەویندا مەلەی دەکرد، جارێ دەکەوتە نێو ناهومێدییەکی ڕەش و تاریکەوە. ئەوینەکەش و ترسەکەشی لە تووڕەیی دەچوو.

هەندێ جار خۆی بە خۆی دەگوت. تا ئەحمەد لە زیندان بێ لەوەندەی پتر چاو پێ ناکەوێ و لەوەش بەولاوە چارێکی دیکە نەبوو. نە باوی نە شا و پادشا یان نە پیری کاروانان، هەر کەسێ، ویستبای ئەحمەدی نەدەدیت. لەم دنیایەدا هیچ نییە چارەسەرێکی نەبێ. بەڵام ئەوەی بێ چارەسەر بوو، ئەوە بوو کە ئەحمەد لە زیندان دەرهاتبا و جارێکی دیکە گوڵبەهار – لە دوورەوەش با – چاوی بە ئەحمەد کەوتباوە. گوڵبەهار بە جۆش و کوڵێکەوە بیری لە شتان دەکردەوە هێز نەبوو خاوی بکاتەوە. ئەوین، ناهومێدی، مردن، لێک دابڕان،

زوڵم و زۆرداری، هەرچی هەست و نەستێکی بوو لە شاخ و باڵکردندا بوو. جێگای بە خۆی نەدەگرت. لەنکاو دایە کزی، هەموو لەشی وەکو لە دنگدا کوترابێ وابوو. نیوەمردوو نیوەزیندوو خۆی وەکێش کرد. هەرچی دەیدیت سەری لێ سوڕ دەما. تۆف و وەیشوومەی گوڵبەهار رەویبووەوە.

گوڵبەهار هەندێ جار بێ ورتە، بێ جووڵە، وەکو ماستی مەییو، چاو خەواڵوو، وەکو مردووێک هەستابێتەوە سەر پێ، سێ رۆژان زاری لێک نەکردەوە و هەروا هات و چوو. دەم و چاوی زەرد هەڵگەڕابوو. زەردێکی کاڵەوەبوو. بریقە لە قژی تۆرابوو. سپێتی لە دانی تارابوو. چاوە گەشەکانی لە نێو بریقەیەکی بێ بندا جارێ دەبریقایەوە، جارێ دەکوژایەوە، لە شیرینترین شوێنی دەم و چاویدا کە غەمزەکانی بوو خەندەیەکی قووڵ، بەختەوەرییەک، شانازییەک مەییبوو. خەم و خەفەتێکی دوور هەموو ئازای گیانی تاساندبوو.

ئێوارەیەک گوڵبەهار لە پڕ گۆڕا، زریانی ئەوینی هەڵی کرد. سەرتاپا غەرقی ئەوین بوو. دیسان ئەوین و دڵدارییەکەی کاری لە دار و بەردان کرد. شەوی بە گوریس بە کێش دەکرد. وەکو قەت شەوگار نەیەت وا بوو. قەت، قەت، قەت، وەکو قەت نەیەت. لە کۆشک و سەرا وەدەرکەوت. ماوەیەک لە دوورەوە نواڕییە ئاورینگ و پریشکی ئاسنگەرەکە، حوسۆی ئاسنگەر بووبوو بە ژێر ڕەهێڵە ئاورینگەوە و بە هاستەم دیار بوو. پاشان چووە سەر گۆڕی ئەحمەدی خانی، نیازی لەسەر گرتەوە. دوعای کرد، لاڵایەوە، پاڕایەوە، کۆمەک و یارمەتی و فریای لێ خواست. دوعا و پاڕانەوەکەی لە هاژەی ڕۆخانان دەچوو، ڕۆخانەی بێ بەست و بەند. کاتێ لەسەر گۆڕخانەی ئەحمەدی خانی جیا بووەوە ڕۆژئاوا بووبوو. ئەو شەوەی کە وەکو مانی گرتبوو و نەدەهات بەسەر چیای ئاگرییەوە نیشتەوە. سووکە بارانێکیش وردە وردە دەستی بە پرووشە کرد. ئیدی هەموو شتێکی لەکن ڕوون و ئاشکرا بوو. کار لە ڕزگاربووندا نەما. دەبوو بەسەر چارەنووسدا کەوتبا. جا چ دەقەوما با قەومابا. بەهەر نرخێکیش با دەبا ببا. سندووقێکی دار گوێزی گرانی نەخشینی لە وەتاغێدا بوو. ملوانکەیەکی زێڕ و زومڕووتی ولاتی قەفقازی لە سندووقدا بوو، وەختی

خۆی نەنکی بە خەڵات دابووێ. پاشان ئەنگوستیلەیەک و چەند بازنێکی مرواری، خڕخاڵێکی زێڕ، کە خاڵی لە هیندستانەوە بە دیاری بۆی هێنابوو، لووتەوانەیەکی نایاب کە ئەویش هەر خاڵی لە ئەفغانستانەوەی بۆ بە دیاری هێنابوو، هەرچی هەبوو و نەبوو هەمووی کۆکردەوە، لە کیسەیەکی مەخمەڵی کردن، ڕێ و ڕاست چوو بۆ زیندان. مەمۆ لە ژوورەوە بوو. گوڵبەهار لە دەرکەی دا، مەمۆ دەرکەی لێ کردەوە، شیرە درێژەکەی تا پاژنەی پێی دەهات، فەرەمکەی لە پۆستی کەڵە کێوی بوو و بە سیم و سورمەی قەفقاز چندرابوو. کڵاوێکی لوای لە سەردا بوو. هەر کە چاوی بەگوڵبەهار کەوت شادییەک بە دەم و چاویدا هات، وەسپ نەدەکرا. بەختەوەرییەک لە دەم و چاوی نیشت تەعریف نەدەکرا. گوڵبەهار ئەم شادی و بەختەوەرییەی لە چاو ون نەبوو. مەمۆ دەم و چاوی دیسان لە پڕ هاتەوە سەر دۆخی جارانی و هەر بە مڕ و مۆچی و تووڕەییەوە ناهومێدی دایگرتەوە. گوڵبەهاریش شڵەژا و ئاواتی لە دڵدا تاسا. مەمۆ دیسان ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و سەری داخست. دەستی لەرزی، لێوی وەتەتەڵە کەوت. لەسەر پێ خۆی نەدەگرت:

گوڵبەهار کیسە مەخمەڵەکەی دەستی بۆ مەمۆ درێژ کرد، گوتی: «بگرە، ئەمانە هەمووی بۆ تۆ».

مەمۆ کیسەکەی وەرگرت تەماشایەکی کرد، دەستی وا دەلەرزی دەتگوت پەلەوەرە وەباڵەفڕکێ کەوتووە.

«جا دەبێ ئەحمەدم لە زیندانێ پیشان بدەی»

کیسە لە دەستی مەمۆ بەربووەوە سەر ڕاڕەوێ، بەو شەوە زرینگەیەکی ڕەقی لێوەهات. گوڵبەهار نوشتاوە کیسەکەی هەڵگرتەوە، دیسان بۆ مەمۆی درێژ کرد. مەمۆ کیسەکەی وەرنەگرت. تنۆکێ خوێن لە دەم و چاویدا نەمابوو. هەرچی خوێنی هەبوو لە لەشی کشابووەوە. دەم و چاوی وەکو کاغەزی سپی لێ هاتبوو.

«بگرە، مەمۆ ها، بگرە. بەو پیاوەی ژوورێم ڕاگەیەنە. جا لە پاشان بچۆ چ

بە باوم دەڵێی بڵێ. با لە سەرم بدا».

مەمۆ هەروەکو خۆی دامابوو. سا پاش هەرچەندێ بوو سەری بڵند کرد، نۆڕییە گوڵبەهار. چاوەکانی لە ئازاری سەرەمەرگ و گیانداندا بوون. هەر هێندەی چاوی مردووێک تروسکەیان تێدا مابوو. گوڵبەهار ناچار چاوی پێ داخست.

مەمۆ بێ گیان، قورس و گران دەستی بۆ بەر پشتێنی چوو. کلیلەکانی لەبەر پشتێنی دەرێنان بۆ گوڵبەهاری درێژ کرد و لەوێ دوورکەوتەوە ڕۆیی تا گوڵبەهار ماوەیەک هۆشی بە خۆیدا بێتەوە، بگری. کلیلەکانی بە دەستەوە بوو، وەستا و حەپەسا. پاشان دەستی بە گریانێ کرد. لە پێش دەرکەی مەمۆ دانیشت، تێر و پڕ بۆ خۆی گریا. قەدەرێ خەریکی ئەوەبوو، هەستێ بچێ بۆ کن دەرکەی زیندان، بەڵام هیچی پێ نەکرا. پاشان زۆری دایە خۆی هەستا، قاچ و قولی بەیەکدا ئاڵا و دڵی وا بە پەلە لێی دەدا وەخت بوو قەفەسەی سینگی بدڕێ و دەرپەڕێ. بەرەو دەرکە چوو. کەڵە کلیلێکی زەلامی لە کلۆمی دەرکە ڕاکرد کردییەوە. زیندان تاریک بوو، لە بنی بنەوەی ژێرخانی زیندانێ ڕووناکییەک دەبیندرا و نەدەبیندرا تروسکە تروسکی بوو. گوڵبەهار بە دەستە کوتکێ لەو پێپلیکانە کۆنانەوە کە بە سەدان ساڵ پێش دروستکردنی ئەم کۆشک و سەراو زیندانە داتاشرابوون چووە خوارێ. لە بنی زینداندا هیچ بەدی نەدەکرا. هەموو شتێ ڕاست و تەخت بوو. چینە قیرێکی ئەستوور لە بنەوە، لەبەر تروسکە ڕووناکییەکە دیار بوو. بۆنی هیچ نم و تەڕەشوعێک لە زیندان نەدەهات. لە بنەوە بۆنی پۆستێکی خۆشەکراو دەهات.

گوڵبەهار لە بنی زیندان وەستا، گوتی:

«سۆفی، سۆفی».

سۆفی کە گوێی لە دەنگی گوڵبەهار بوو، بە هەڵەداوان بە دەنگییەوە هات، گوتی:

«فەرموو سوڵتانەکەم، ئەوە چۆن گەیشتوویە ئێرە؟ بۆ خاتری خودا زوو



بە یەککگەیشتنی ئەحمەد و گوڵبەهار

بگەڕێوە، پاشا پێ بزانێ لەسەری هەموومان دەدا. کچی چابە بڕۆ. یەکەم ژنێ کە تا ئێستا ڕێی کەوتبێتە ئێرە تۆی. بڕۆ، بڕۆ، بڕۆ، دەخیلە خۆ کەس لە ڕێگا نەیدیتی.»

«ئەحمەد کوا؟ خەبەری بدەیێ».

«باشە، باشە، هەر ئێستا».

لە تاریکاییەکەدا چرپە چرپێک هات، پاشان هەموو شتێ لە نێو گۆمی بێ دەنگی و کپیدا خنکا. گوڵبەهار دڵی بە تەپە تەپ کەوتبوو. بەردی سارد و سڕی زیندان دەبریقایەوە، یا گوڵبەهار چاوی ڕەشکە و پێشکەی دەکرد.

چاوەنۆڕ بوو، کەس نەدەهات. تا دەهات هێندەی دیکە جۆشی پتر پەرەی دەستاند، دڵی لە دڵی کێشکەیەک زیاتر و خێراتری لێ دەدا.

گوڵبەهار، بە قەدەر ئەوەندەی تارماییەک لە بنەوە درێژاودرێژ وەسەرپێ کەوێ و بەرەو ئەوێ بێ، هەر بەو حاڵە مایەوە. کچە هەر کە چاوی بە تارماییەکە کەوت دەجمێ، شاگەشکە بوو. دەماری دەست و پێی وەکو ژێ ڕەوەیەوە و خاو بووەوە. سەری خولاوە. بە دیوارەکە نەگەیشتبا دەکەوت.

هەر کە هەناسەی گەرمی ئەحمەدی بەر دەم و چاو کەوت بە خۆدا هاتەوە. هەردووکیان بە حەپەساوی ماوەیەک هەروا وەستان و مانەوە، شتاقیان ورتەیان لێوە نەهات.

لە پێشدا ئەحمەد گوتی:

«گوڵبەهار، ئەوە تۆی؟»

گوڵبەهار بە ئاسپاییەوە:

«منم».

دەتگوت زۆر لەمێژتر دڵداری یەک بوون و بە یەک گەیشتبوون. هەردووکیان کەوتنە نێو هەور و هەڵایەکی ئەوینەوە. گەرم و گوڕ، جوان، دۆستانە، ئەوین و دڵداری بە نێو هەموو کون و کەلێنی زینداندا بڵاوبووەوە. برێ کەوی دەندووک سووریش لە زیندان بوون. کێ دەیزانی سۆفی لە کوێی پەیدا کردبوون،

نیوەشەو با، سبەینان با، هەر وەختێکی با، هەر کە کەیفیان سازبا، وە قاسپە قاسپێ دەکەوتن. لە بنەوە قاسپەی کەو هات. گوڵبەهار بە دەنگی کەوەکە ڕاچەنی. دەستی ئەحمەدی گرت و لە پێپلیکانان وەسەر کەوتن و چوونە ئەو لای قووللەی زیندانەوە. قووللەکە بەسەر دەشتەکەیدا دەڕوانی. دوو هەنگاو بەولاوەترەوە هەزار بە هەزار و هەڵدێرێ بوو نە سەری دیاربوو نە بنی. تاریکاییەکی بە سام، سێبەری ڕەشی ئاگری، ئەستێرە دوورەکان، پێدەشتەکان، تەپە و تەلانی پێچابووەوە. کۆنە مانگێکی کاڵەوەبووی دیوێک سڕاوە، کز کز بەسەر چیای ئاگرییەوە هەڵواسرابوو. پاش ماوەیەکی زۆر کورت پەڵە هەورێکی ڕەش و تاریک دایپۆشی. گوڵبەهار هێشتا دەستی لە نێو دەستی ئەحمەددا بوو. بەدەم ڕێگاوە هەستی بە گڕی نێو دەستی دەکرد.

لەگەڵ بانگی کەڵەشێران هەردوکیان لە بن قوللەکەوە هەڵستان.

وەکو پشکۆیەک چۆن دەبێ بە دوو کەرتەوە، بەو ڕەنگە لێک دابڕان و دەستیان لە دەستییەک پچڕی. بە گوڵبەهار بووایە قەت لێک دانەبڕابان و تا ڕۆژ دەبووەوە بەو ڕەنگە کڕ و بێدەنگ دەستی لە نێو دەستی ئەحمەددا با و ماوەی پتری بەو ژوان و بەیەک شابوون و دەست لە نێو دەستنانە ترسناکە بدابا. جا خوا دەیکرد خاکیان بە خوێنی ئاڵ دەکرد. جارێکی دیکەی دەست لە نێو دەستی ئەحمەد ناوە. دوو پشکۆ دیسان یەکیان گرتەوە و بەیەکدا جۆشیان خوارد. دەوروبەر بەرە بەرە ڕووناک دەبووەوە. گوڵبەهار و ئەحمەد دیسان دەستیان لە دەستی یەک بەردا. ئەحمەد لێی دا ڕۆیی، چووەوە زیندان. گوڵبەهار گوێی لە داخستنی دەرگا زەلامەکەی زیندان بوو. پاش هەندێ قەدەرێک هەروا مایەوە، نەیدەزانی چ بکا و بۆ کوێ بچێ، بەڵام دوایی چاوی بە کلیلەکانی زیندان کەوت، کە دەبوو بە مەمۆی دابانەوە. بەرەو دەرگەی زیندان چوو، ئینجا چووە ژوورەکەی مەمۆ. دەرگەی ژوورەکەی لەسەر پشت بوو، مەمۆ لە ژوورێ نەبوو. شڵەژا و بە هەڵەداوان کەوتە پەیدۆزی و بەم سەر و ئەو سەری کۆشک و سەرا و ڕاڕەواندا دەهات و دەچوو. پاشان لە دەرەوەی شوورەی قەڵا، بە لای ڕاستی دەرکەوە، پاڵی بە دیوارەوە دابوو، لەوێ

دیتـیـیـەوە. هەر دەتگوت مـردووە، جـووڵەی نـەدەکـرد. تەنانەت تـەقـەی پـێی گوڵبەهاریش مەمۆی بەهۆش نەهێناوە.

گـوڵبـەهار کلیلەکـانی لە بناگـوێی مـەمـۆ زرینگاندەوە، کەچـی هیچ جـۆرە نیـشانەیەکی گۆڕان لە سـەروسیـمـای مـەمـۆدا بە دیارنەکـەوت. نەخێـر هەر چاوەنۆڕ بوو، سـا بـەڵکو بە بارێکدا، بە حـاڵێکدا بگۆڕێ بەڵام هەر نەگـۆڕا، ئەوجا ناچار دەستەیەک کلیلی بەردایەوە نێو کۆشی، گوتی:

«کاکە مـەمۆ، زۆر سوپاس، ئەم چاکـەیەتم تا مردن لە بیر ناچێتەوە» دیسان هیچ جـۆرە گـۆڕانـێ لە سـیـمـای مـەمـۆدا نەخـوێندرایەوە. ئەنجا گـوڵبـەهار لێی دوورکەوتەوە و ڕۆژهەڵات.

ئەحمەد وەکو بەردی بن گۆم بێ سـەر و شوێن لە زینداندا مایەوە.

ئەحـمـەد هـەرچەندی دەکرد بڕوای بەم پەرجووە بەدیهاتووەدا، بەم ئەفسوونە گڕاوییـەی گـوڵبـەهاردا، بەم بۆن و بەرامـە ژنانەیەدا نەدەهاتەوە و وەکو خـەون ببـینـێ وا بوو و لەخـۆڕا وە گـومـان دەکـەوت و لە خـۆی دەپرسـی: خـەونە، ڕاستەقانییە، ئیدی تا نێو مـۆخی هێسکانی، ئەوین و دڵداری ڕۆچووبوو و لە هەموو ئازای گیـانییەوە سەرڕێژی دەکرد و پاشان بای دەداوە سـەر هەست بە بەخـتـەوەری، ئینـجـا جـارێکی دیکە خـامـۆشـی، بێ بڕواییی لە هەمـوو ترووسکەیەکی دەدزییەوە.

کەواتا ئەسپەکە بۆ ئەمە هات، لە پێش دەرکەی وەستا.

کـەواتا خـوا لە چارەی نـووسیـوە. ئـەم ئەسـپـە، ئەم کـیـژە دیاریی خـوایە، خـەڵاتی چیـای ئـاگـرییـە و پێی بەخـشـیـومن. دەبـێ شـیـاوی ئەم خـەڵاتە بم. گوڵبەهار وەکو گولیلکی بۆن تیژی چیای ئاگری، تەڕ و بڕ، پاراو، توناو، لە تەندروستیدا وێنەی نەبوو و پیاو سەری لێ سوڕ دەما.

ئەحمەد گوتی:

«سۆفی ئەو بلوێرەم بدەیێ».

سـۆفی بلوێری دایە. سـۆفی و مـوسـا بەگ و زیندان و کـەوەکان گـوێیـان لە

مقامێکی نوێ و نەبیستراو گرتبوو. گوڵبەهار بیستبای شاگەشکە دەبوو و لە تاوان دەکەوتە کێوان.

ئەوێ ڕۆژێ گوڵبەهار بێ وچان، لە ماڵێ وەکو ماخۆلانی بێ، هەر دەهات و دەچوو و نەدەسرەوت. مات و مەلوول، پەرێشان، نەخەو، نەخۆراک، خەورۆ، ئیدی وەکو بەسەر دنیاوە نەبێ وابوو. باوی، ئەحمەدی ئازاد نەدەکرد، ئازادیشی کردبا جارێکی دیکە چاویان بە یەک نەدەکەوتەوە. پاشایەک چۆن کیژی خۆی بە چیاییەکی وا ڕەوا دەبینی؟ چیاییەکی یاخیی سەرکێش و کەڵەوەکێشی وەکو ئەحمەد. گوڵبەهار کە گوێی لە دەنگی بلوێر بوو بە خۆدا هاتەوە. ئازای لەشی سەرتاپا لە مچورک نیشت.

بریا ئەحمەد لە زیندان ئازاد با، شەوێک لەنکاو هاتبا، پیلی گرتبا، هەڵی دابا سەر ئەسپ و بەرەو پێدەشتانی پڕ مامزان ئاژوابای. جا لەوێ، چەند خۆش بوو، ڕەشماڵ و کۆن و دەواری درێژ درێژ و هەراو و بەرینی کوردان، هۆبە و چاوخانی کوردانی دیتبا و لەو ماڵە کوردە میوان دۆستانە میوان با.

ئەوی ڕاستی بێ، بە چاوێکی تایبەتی دەیاننۆڕییە ئینسانانی چیای ئاگری. خەڵک وەکو زیندەوەری دنیایەکی دیکە، وەکو شتێکی پیرۆزیان لە قەڵەم دەدان. جا وا چووش، وا هەموو شتێ بە گوێرەی خواست و ئارەزووی ئەو ڕەخسا، خۆ باوی، لەوپەڕی دنیاش بێ لە پەڕەی هەور بێ دەستی دەیگاتێ و لەسەری دەدا، ئەحمەدیش دەکوژێ. ئیدی هەروا بیری دەکردەوە و هەناوی هەڵدەقرچا.

ئەو شەوەش دەبوو بچێتە کن ئەحمەد. بەڵام باوی پێ بزانێ لە سەری ئەحمەدیش و خۆشی و مەمۆشی دەدا. مەمۆ زۆر خۆشحاڵ بوو. قەتی هێندە زێڕ و زەمبەر وەچەنگ نەکەوتبوو. کلیلەکانی دابوویێ و ڕۆیشتبوو. هەرچەند مەمۆی وەبیر دەهاتەوە و دەم و چاوە مڕ و مۆچەکەی دەهاتە پێش چاوخەم دای دەگرت و هەولی دەدا لە بیری خۆی بباتەوە و نەیدەویست بیری لێ بکاتەوە. لە ناخی دڵییەوە هەستی بە شتێک کردبوو و زۆر لە مێژ بوو شتێکی لە مەمۆدا شک دەبرد. مەمۆ زۆر پیاوانە لە گەڵی دەجووڵایەوە. لەوە دڵنیابوو

که هەر خواستێکی لێ خواستبا بۆی جێبەجێ دەکرد و دریغیی لێ نەدەکرد.

گوڵبەهار دەیویست هەموو شەوێ چاوی بە ئەحمەد کەوێ، بەڵام چۆن دەکرا هەموو شەوێ داوای کلیلی کردبا و دەم و چاوە مڕ و مۆچەکەی دیتبا. مەمۆ مردنی خۆی لە کلیل وێدانێی گەلێ پێ خۆشتر بوو. ئەمە کارێ نەبوو، تەنیا هەر گوڵبەهار پێ بزانێ، لەوانە بوو خەڵکی دیکەش پێی زانیبا. هەست و نەستی گوڵبەهار ئێجگار سەرکێشانە بوو، بەرانبەر هەموو شتێ، بەرانبەر باوکی، بەرانبەر پاشەڕۆژ، بەرانبەر کۆشک و سەرا، بەرانبەر چیای ئاگری، بەرانبەر، هەموو دنیا بێ پەروا بوو.

لە دیوەخانەوە دەنگە نێرەکەی باوی دەهات. مەحموود خان پیاوێکی زۆر لەبار بوو، بەتایبەتی کاتێکی بە کوردی داخاوت خۆ ئەوە هەر بە جارێ لە دڵەوە، بەگەرم و گوڕتر، زۆر بە سەلیقەتر و لەبارتر دەهاتە دوو.

دەتگوت کەڵە خەرتەلە. گوڵبەهار تا ئەو دەمی باوی هەر خۆش دەویست. باویشی بەوەی دەزانی کە گوڵبەهار خۆشی دەوێ.

ئێوارە داهات. ڕۆژ ئاوابوو. گوڵبەهار لە کۆشک و سەرادا هەر دەهات و دەچوو و بستێ لە پێش دیوەخانێ نەدەبزووت. دیوەخان چۆڵ بووبوو. دەبوو بابی نوێژی شێوان بکا.

گوڵبەهار بیری کردەوە: چۆنە بچم بەسەر دەست و پێی مەحموود خاندا بکەوم، بڵێم: من کچی تۆ نیم مەحموودخان، من بە تکاکاری هاتوومە خزمەتت. بە کڕنووش و لەسەر چۆکان هاتوومە بارەگا و خاک و پات. پیاوی چا بە لە ئەحمەد خۆش بە، لە ڕەگ و ڕەگەمای خۆت لاری مەبە مەحموود خان. نکووڵی لە تیرە و نژادی خۆت مەکە مەحموود خان. پشت لە هۆزی خۆت مەکە مەحموود خان. تۆ بە تیرە و ڕەگەز خەڵکی ئاگریت، باپیرم دەیگوت، تا ئێستا نەتزانیوە مەحموود خان؟ ئەگەر دەڵێم لە نێزیکی ماڵەومان گەلێ هێلانە خەرتەل و شەهێن و باز هەبوون.

جارێکیان هێندەی نەمابوو بچێتە ژوورێ بەڵام خۆی گرت. دەچوو بەسەر

دەست و پێی خاندا بکەوێ. دڵی هاتبووە سەر لێوانی. بەخۆ وەکێش کردن، سا بە هەرچۆنێکی بوو لە دەرکەی دیوەخانێ دوور کەوتەوە. ئەگەر بۆ خۆی با کار هاسان بوو. بەڵام باوی بەو کارەی زانیبا بێ سێ و دوو ئەحمەدی دەکوشت.

تا نیوە شەوێ نەنووست. خەڵکی بایزید هەموو لە خەوێکی قووڵدا بوون. جگە لە زرەی چەند کۆت و زنجیرێک کە لە زیندانەوە دەهات، ئیدی دەنگی هیچ نەدەهات. گوڵبەهار ماوەیەکی دوور و درێژ لە نێو جێگادا ئەم دیو و ئەو دیوی کرد.

ئەو کارە بێ ئاکام بوو. هەر ڕۆژێکی با دەستەوبەرۆکی دەبوون و باوی ئەحمەدی دەکوشت. هیچ ڕاز و نهێنییەک لە سەرادا نەدەشاردرایەوە ئەوڕۆ یەک، دوێنێش دوو، خوشکەکانی گۆڕانێکیان تێدا سۆسە کردبوو. لەوانە بوو یەکێ بە ژوانی دوێ شەوێیانی زانیبایە و بۆ سبەینێ کۆشک و سەرا کەوتبا خرۆش و هەژانێ، یا مەمۆی سەرەک زیندان ڕاستیی لەکن باوی لێ گوتبا و سەری خۆی کڕیباوە. تۆ بڵێی مەمۆ ڕاستی لێ گوتبا؟ نەیگوتبا؟.

ئەو هەموو بیرکردنەوە و هەراسانی و ترس و لەرزە لەوەندەی پتر لە نێو جێگا پێ ڕانەگیرا. لە پڕ خۆی لەبەر دەرکەی زیندانێ دیتەوە. قەدەرێ لەوێندەرێ ئەمسەر و ئەوسەری کرد و وەستا. ئەوجا گەیشتە بەر دەرکەی مەمۆ. ماوەیەکیش لەوێ وەستا. هەرچەندی دەکرد نەیدەوێرا لە دەرکەی بدا. چەندین هەست و سۆسەی ترس و شەرم و پەژارە لە دڵیدا شەڕە زورانیان بوو. مەمۆ لە ژوورەوە دەیزانی گوڵبەهار لە دەرێ وەستاوە و هەروا بیری دەکردەوە. لە نکاو دەرکەی لێ کردەوە. بەڵام گوڵبەهار هەرکە چاوی پێ کەوت پاشەو پاش گەڕایەوە و دەستی بە ڕۆیشتنێ کرد. مەمۆ بە رفکان وەدووی کەوت، کلیلەکانی بۆ درێژکرد و ژوورەکەی پیشان دا، گوتی:

«لێرە قسە بکەن، زۆر بە ئاسپایی، هەر هێندەی ببیسترێ و نەبیسترێ».

گوڵبەهار بە هەموو هێزێکییەوە دەرگانەی زیندانی کردەوە. لە پێپلیکانە بەردەکان چووە خوارێ.

بانگی کرد: «سۆفی، سۆفی».

ئەحمەد هەناسەی لەبەر خۆی بڕیبوو، لە ئێوارێوە چاوەنۆڕی بوو. لەوەتی ڕۆییبوو هەر چاوەنۆڕی بوو. گوێی لە سرتەیەک با بەرزە پێ ڕادەچەنی.

دەسبەجێ بە پیری گوڵبەهارەوە چوو. دەستیان وەکو پشکۆ یەکیان گرت.

مەمۆ بۆچی ژوورەکەی بۆ دەستنیشان کرد و گوتی بە ئەسپایی قسە بکە. تۆ بڵێی مەمۆ پیاوچاکێکی پێگەیشتووی خاوەن بەهرە و کەرامات بێ. مرۆیەکی هێندە جوامێر و پیاوچاکی وەکو مەمۆ دەشیا بێتە سەر دنیا؟ گوڵبەهار بێوانییەکی بە دڵ و دەروونندا هات. ئەحمەدی بەرەو لایەکی دیکە، دیسان بۆ سەربانی زیندان، بۆ لای ڕاستی قوللەی زیندانێ برد. هەردووک لە بن دیوارەکە ڕۆچوون. دڵ بە دڵەوە، دەست لەناو دەست، بێ جووڵە قەدەرێ مانەوە. لەو کشوماتی شەوەدا گوێیان لە کشانی خوێنی یەکتر بوو.

«ئەرێ ڕاستە؟».

ئەحمەد پرسی:

«چی؟»

گوڵبەهار گوتی:

«گۆیا، ئەگەر لە ماوەی چل ڕۆژدا ئەسپەکە نەدەیەوە، باوم لە سەری تۆش و سۆفیش و موسا بەگیش دەدا».

ئەحمەد گوتی:

«ڕاستە».

گوڵبەهار، نووزەیەکی لێوە هات، بەڵام شتێکی ئەوتۆی نەگوت ڕوون بێ.

«وەبیرت هاتەوە؟ ها، لەو شاییەدا کە لە زۆزانی گۆلی کوویە کرا؟»

گوڵبەهار گوتی:

«جا، قەتم لە بیر دەچییەوە، سەرۆک ڕەوەند، ئەوە تۆ بووی، ئەدی تۆ؟»

«ئەمنیش هەر وەکو ئێستاکە لە پێش چاومی. ئەوە بوو خڕخاڵت لە

مەرجانی سوور لە پێدا بوو».

گوڵبەهار شیرن شیرن، لەخۆ چوویوو و لە خەوندا دەفڕی و دەیگوت: «لە زۆزانێ، دەنگبێژێکی قژ درێژ سێ شەو و سێ ڕۆژان لەسەر گۆڵی کوویە گۆرانیی سلێڤی بۆ سەید ئەحمەد دەگوت و لێ نەدەبووەوە. گۆرانییەکەی هێشتا هەر لەبەر مابوو».

ئەحمەد گوتی:

«ئەو، ئەو گۆرانییە بە چل ڕۆژان دەڵێ، زۆر درێژە».

گوڵبەهار هەناسەیەکی لە ناخەوە هەڵکێشا، گوتی:

«ئەسپەکە نەگەڕێتەوە، باوم لە سەری هەرسێکتان دەدا».

ئەحمەد گوتی:

«لە سەری ئێمە دەدا، بدا، بەڵام لەسەری سۆفییەکی سەد ساڵە دەدرێ؟ ئەمە ستەم و زوڵمە. ستەمێکە، لەوەتی دنیا دنیایە، نەکراوە و نەبیندراوە. حەیف و مخابن بۆ سۆفی. زۆر پیر و کەنەفتەیە. بەڵام گوێ ناداتێ پەروای پێ نییە. هەمیشە بە پشتی کۆمەوە بلوێر دەژەنێ و پێ دەکەنێ و هەڵدەپەڕێ. حەیفم بە سۆفیدا دێتەوە. زۆریشم حەیف پێدا دێتەوە. دەستم ڕۆشتبا ڕزگارم دەکرد. لە سەری بە تەمەنی وەکو ئەو نادرێ. پاشا گوتوویە لە پێشدا سەری سۆفی دەپەڕێنم، لەپێش چاوی خۆشیان ئەمەی گوتووە».

گوڵبەهار گوتی:

«لەسەری کەس نەدرێ».

ئەحمەد کڕ بوو.

گوڵبەهار باوەشی پێدا کرد.

ئەحمەد گوتی:

«پاشا پێ نەزانێ، دەنا لەسەری تۆش دەدا».

گوڵبەهار لە تێری و بەوپەڕی بێ پەرواییەوە هەڵیدایێ، گوتی: «با لەسەرم

بدا، با بمکوژێ».

ئەحمەد گوتی:

«بەزەییم بە موسا بەگیشدا دێتەوە. ئەویش لە نێوچاوانی منەوە. نازانم ئەسپەکەی وێ دەمەوە؟ سەری سۆفیش و موسا بەگیشی پێ بکرمەوە. بەڵام ئەوانی لەمەڕ خۆمان قایل نابن. ئەوا قایلیش بوون و داشیانەوە، جا پاشان کە لە زیندان دێمە دەرێ، چۆنیان چاو لەبەر هەڵێنم؟ هەنگینێ دەڵێن لە ترسی ڕۆحی خۆی خەڵاتی خوا، بە پاشا داوەتەوە و ئەوجا وەرە چاو لەبەر خەڵک هەڵێنەوە. ئەدی ڕۆحی سۆفی، ئەی گیانی موسا بەگ؟».

گوڵبەهار وەکو مستە کۆڵەیەکی بە دەمدا درێ، سەری خستە نێو باوەشی ئەحمەدەوە، دایە کوڵی گریانێ. لە دڵی خۆیدا هەر دەیگوت: هەڵترۆپێ ئەسپ، هەڵترۆپێ ئەسپ، هەڵترۆپێ.

کەڵەشێری بەربەیانێ خوێندیان. تیشکی ڕۆژ بە ملە و گەردنی ئاگرییەوە سوور دەچووەوە. تیشکی تاین تیشک نەبوو، بلوورییەکی سووری درشتی خڕی هەڵایساوی وەکو سێو وابوو، سێوێک لە شووشە دروست کرابێ.

دەستیان وەکو پشکۆیەک لێک هەڵبڕان. ئەحمەد بەرەو زیندان چوو. هەرچی گوڵبەهار بوو، بێ جووڵە، چاوی تێ بڕیبوو و ڕەق مابووەوە و هێزی هەڵستانی دە ئەژنۆدا نەمابوو. دەمە و نیوەڕۆیە ئەنجا توانی ڕاست بێتەوە. هەر وەخت بوو بخنکێ. باوی گوتبێتی دەیکوژم، دەیکوژێ. جا خوای دەکرد فەرمانی بەخشینی لە پادشاوە بۆ دەهات. کەس نەیبیستبوو پاشا لە قسە و بەڵێنی خۆی پەشیمان و پاشگەزبێتەوە. ئەحمەد تا بڵێی لە بارێکی نالەبار و دژواردا بوو. ئەگەر ئەسپی دەداوە و لە زیندان دەردەچوو، لە چیا و لە پێش چاوی چیاییان بە مردوو حسێب بوو. ئەدی گوناهی سۆفی و موسا بەگ چییە؟ خۆ ناشێ لەگەڵ خۆی لە بۆ مردنیان وەکێش کا؟ ئەحمەدیش و گوڵبەهاریش بەو ڕەنگەیان بیر دەکردەوە. تەنانەت مەرگیش ئەحمەدی ڕزگار نەدەکرد.

گوڵبەهار ئومێدی بە تروسکەیەکی تروسکە ئاسایی نەمابوو. جا بە ڕاستی هەر هیچ جۆرە تروسکەیەک لە هیچ لایەکەوە بەدی نەدەکرا. نائومێدی لە هەموو لاوە وەکو سێڵاوێکی گران تا دەهات پتر هەڵدەستا و بڵندتر دەبووەوە. دەیخنکان. لە تەمەنێکدا تەنیا چل ڕۆژ خۆشی. تا مردن، هەموو مایەی شادییەکی هەر ئەوە بوو هەر ئەوە. شادییەکی چل ڕۆژە و بەس. ئەویش دەست لە نێو دەست خستنی مردووێک، شادیی لە باوەشکردنی پیاوێکی لە ملدراو. جا گریمان ئەحمەد ئەسپەکەشی دایەوە و جڵەوی لە مست خاوەنی نا و لەسەری نەدرا و ڕزگار بوو، خۆ گوڵبەهار جارێکی دیکە، عومرێک، چاوی پێ نەدەکەوتەوە. ئەحمەد دەگەڕایەوە نێو چیا و چۆڵی خۆی، ئەویش لەو کۆشک و سەرایەدا وەکو بەردی بن گۆم بێ سەر و سەودا بۆ خۆی دەمایەوە. بۆ ئەو ژیان هیچی وای بە بەرەوە نەمابوو. سەرەڕای ئەوەش ئەحمەد ئەسپەکەی نەدەداوە. هەنگێ لەپێش چاوی گوڵبەهار لە ملیان دەدا، سەرە خۆیناوییەکەیان بە دارێکەوە دەکرد، پۆل پۆل لە نێو شار خەڵکیان وەدوو دەخست. ڕیشە زێڕینەکەی لە خوێن وەدەردەدرا. ئەوسا چۆنی ماچ کردبا، خۆ لە خوێنی گەشیان وەردەدا، ئیدی گوڵبەهار لەبەرخۆیەوە ئەمانەی دەگوت و دەگریا.

لاشەی ئەحمەدیان لەسەر قوللەی قەڵاوە فڕێ دەدا خوارێ و تا لە بن ئەو هەڵدێر و هەزار بە هەزارەدا دەگیرساوە و پارچە پارچە دەبوو. گوڵبەهار بۆ ئەحمەد دەلاوایەوە و ڕۆحی بەسەر دەستییەوە، بیری لە چارەیەک دەکردەوە: چۆنی ڕزگار بکا، ئەو ئەحمەدەی خۆی گوتەنی کە: «دڵی نەدەهات ماچی بکا» دەیگوت: ئەو با بژی جا یاڵلای دەکرد تا مردن چاومان بە چاوییەک نەدەکەتەوە. ئەو با بژی، ئەو با بژی، خوای دەکرد لەو چیایانە هێندەی گەلەگورگێ منداڵ و زا و زاتوولی دەبوو. ئەو هەر هێندە قوتار بێ و بژی. ئەو با بژی. من بمرم».

لەوانەش بوو زڕە ئومێدێ هەبا. باوی موسا بەگ دەیهێشت هەر وا بە خۆڕایی لەسەری کوڕی بدەن؟ ئەدی بەگە کوردەکانی دیکە؟ موسابەگ

دەسخەڕۆی دەستی وان بوو. ئەگەر چووبان ئەسپەکەیان لە پێناوی سەری سۆفی و ئەحمەد و موسا بەگدا داوا کردباوە، ئاگرییاییەکان ڕایان لەسەر با، چیاییەکان ئەسپەکەیان نەدەداوە؟

چیاییەکان کەللەشەق و سەرڕەق بوون. گوێیان نەدەدا کەس، بەڵام تکاکار و پەنابەریشیان، هەرکەسێ با، بۆ هەرچی با، هەروا سانا، سانا بە ناهومێدی و دەستی خاڵییەوە نەدەگەڕاندەوە. هەموو شتێ لە چیای ئاگری بەپێودانی نەریتە. کەس نەیدەتوانی سنووری بشکێنێ. ترووسکەیەکی ئومێد لە دڵی گوڵبەهاردا چەکەرەی کرد. لە پاشان لەپڕ بە بیریدا هات گوتی: ئەگەر بچم بۆ خۆم ئەسپەکە لە چیاییان داوا بکەمەوە؟ خۆ ناشێ دەس بە ڕووی ژنێکی وەکو منەوە بنێن. ئەگەر بەگەکان لە باوم ترسان، نەچوونە کن چیاییەکان ئەوە بۆ خۆم دەچم، بۆ خۆم دەچمە کن چیاییەکان. ئەحمەدم ڕزگار دەکەم. ئیدی جارێکی دیکە تا مردن چاوم بە چاوی ناکەوێتەوە. یاڵلای دەکرد هێندەی گەلەگورگێکی منداڵ دەبوو.

دەبوو سەر ڕشتەی کارەکەی لە یەکێکی سەر ڕاست ڕاگەیاندبا. لەوانەش بوو بۆ خۆی چووبا کن چیاییەکان. یا خەبەرێکی بۆ باوی موسا بەگ ناردبا بچێتە کن چیاییەکان.

ئەوێ شەوێیی بە پەژارە و دوودڵییەوە کردەوە. یوسفی برای یەک دایک و یەک باوی زۆری خۆش دەویست. ئەگەر گرێی ئەو ڕازە لەکن یوسف بکاتەوە تۆ بڵێی نەیکوژێ؟ بڕوا بە یوسف دەکرا؟ یوسفی لەگەڵ دەچوو بۆ داواکردنەوەی ئەسپەکە؟ ئەوا گوتمان یوسف بە هەموو شتێ قایل بوو، بەڵام هاتو چیاییەکان بە بارمتەیان گێڕایەوە؟ یا ئەگەر بۆ خۆی بە تەنیا چووبا خۆیان گل نەدەداوە. گوڵبەهار بە خۆیدا هەڵکالا و گوتی، بە ڕاستی ئەمەی من لەگەڵ چیاییەکاندا دەیکەم ڕەفتارێکی ناڕەوا و ناهەقە. ئەوان وەکو باوم نین، میوان بێ، تکاکار بێ، بە بارمتە کەس گل نادەنەوە. ئەوان لاقەی ژنێکی تکاکار بۆ هەر چییەک بێ ناکەن و ژن هەرچۆنێکیان لەگەڵ بکا دەستی بۆ درێژ ناکەن. هەستا چووە وەتاغی یوسف هێشتا نەنووستبوو، خەریک بوو



گوڵبەهار دەچێتە کن یوسفی برای و هەموو شتێکی پێ دەڵێ

شیرێکی لە هەسان دەدا، تیژی دەکرد، زاخاوی دەداوە، نەخش و نیگارەکانی دەدرەوشاندنەوە، جەوهەرەکەی پەرداخ دەکرد.

کە چاوی بە گوڵبەهار کەوت بزە وەسەر لێوانی کەوت؛ گوتی: «ئەوە چییە گوڵبەهار، خێرە بەو شەوە؟»

گوڵبەهار چوو لە تەنیشتیەوە دانیشت. یوسف ڕوخسارێکی درێژکۆڵەی بێرەنگی پێوە بوو، دەتگوت بەر ڕۆژ نەکەوتووە، کەڵەکەتێکی بەژن بڵند بوو. بە ڕوویەکی زۆر خۆش و گەشەوە نۆڕییە گوڵبەهار چاوی پڕ بوون لە پرسیاران. گوڵبەهار دەستی لە ملی برای کرد دایە کوڵی گریانێ. پاش ماوەیەک گریان، یوسف بە دەنگێکی سارد و سڕی وەک سەهۆڵەوە پرسی:

«ئەوە چییە، گوڵبەهار بۆ دەگریەی؟»

گوڵبەهار گوتی:

«ئەوی چاری دەردم بکا هەر تۆی یوسف».

یوسف چاوە گەشەکانی زەق کردەوە، گوتی:

«دەردت چییە؟»

گوڵبەهار لێوی دایە تەتەڵە و لەرزینێ. بەینێ کڕ بوو، ئەوجا گوتی:

«مەگەر تۆ لە مردنێم ڕزگار کەی».

یوسف بە جارێ شڵەژا، شپرزە بوو، قیژاندی:

«کچێ، ئەوە چییە؟»

گوڵبەهار گوتی:

«باوکم بە تەمایە لەسەریان بدا. دەبێ نەهێڵین. با بچین ئەسپەکە لە چیاییەکان داوا بکەینەوە. ئەگەر ئێمە لێیان داوا بکەینەوە دەماندەنەوە. یوسف، برام، پیاوی چابە بابچین بۆ کن چیاییەکان. دەکرێ؟ ئیدی گوڵبەهار بە پەلە پەل قسەی دەکرد و یوسفی دنە دەدا.

یوسف گوتی:

«جا بە تۆ چی؟ ئەتوو چت بە سەر وانەوە داوە؟ باوم لەسەر هەقە و ئەوان غەیانن و لەسەریان دەدا. بەتۆ چی؟»

ئیدی لەپڕ قسەکەی وەکو چەقۆ بڕی، زەق زەق نواڕییە گوڵبەهار گرماندی، گوتی:

«یاخۆ گوڵبەهار، یاخۆ؟»

گوڵبەهار بە دەنگێکی دەبیستراو نەدەبیسترا، گوتی:

«ئیدی وایە».

یوسف بەرزەپێ هەڵستا سەر پێیان، گوتی:

«ئەو ئەحـــــمـــــەدە، ئاوا ها؟ باوم دەتکوژێ. دەتکوژێ. باوم دەتکوژێ، دەتکوژێ.»

یوسف لە ژوورەوە دەهات و دەچوو، تا دەهات هێندەی دیکە هەڵدەچوو و شاخ و باڵی دەکرد، هێند سەیر بوو دەتگوت شاییەکی کەونارای ئاگر دەگێڕێ و بێ پشوو دەیگوت:

«باوم دەتکوژێ، دەتکوژێ، دەتکوژێ، دەتکوژێ، دەتکوژێ.» و وەکو وڕێنە بکا هەر دەیگوت و دەیگوتەوە. پشوویەک نەدەسرەوت. لە ترسان چاوی ئەبڵەق بووبوو.

گوڵبەهار پێی وابوو ئاقڵی تێک چووە.

«کوڕە یوسف ئەتوو شێت بووی؟»

یوسف دایە تریقەی پێکەنینێ، گوتی:

«ئەتوو شێت بووی، ئەتوو. ئەتوو شێت بووی، ئەتوو. باوم هەر دەتکوژێ».

گوڵبەهار بەوپەڕی ورەوە گوتی:

«یوسف، یوسف، یوسف، لەگەڵم دێی بۆ داواکردنەوەی ئەسپەکە؟»

«تۆ شێت بووی، تۆ شێت بووی؟»

«ئاخر ئەگەر ئەسپەکە نەیەتەوە بێ سێ و دوو لە ملی ئەحمەدی دەدەن.

ئەمنیش خۆم دەکوژم».

«گوڵبەهار ئەتوو خۆت مەکوژە. چ دەبێ خۆت مەکوژە. ئەمن بۆ ئەسپ وەرگرتنەوە نایەم. باوم دەتکوژێ. ئاخر چۆن دەبێ. چ ڕەوای هەقە ئەتوو خۆت بکوژی. ئاخر چۆن دەبێ گوڵبەهار؟» یوسف شڵەژابوو. زمندەقی چوو بوو. ترس و شڵەژانی یوسف گوڵبەهاریشی شڵەژاندبوو. گوڵبەهار دەستە و دامێنی یوسف بوو و بە نووزانەوەوە گوتی: «چ ئومێدم پێت نییە، بەڵام برای چابە ئەو ڕازە لە کن کەس مەدرکێنە یوسف».

یوسف گوتی: «چۆنی دەدرکێنم، گوڵبەهار».

یوسف ئێجگار سەیری لێ بەسەرهاتبوو. لە پەژارەیەکی زۆر ناخۆشدا بوو. هەر دەتگوت پەلەوەرێکی چکۆلەیە و لە ترسان خۆی لە نێو هەردوو باڵیدا گورمیلە کردووە.

گوڵبەهار قەتی بەو ڕەنگە لە یوسف چاوەنۆڕ نەبوو. تا بڵێی ئازا، کەمتەرخەم، مەردانە، دەهاتە پێش چاو. بەڵام تۆ وەرە ها، چۆنیش هەڵخەڵەتابوو، تۆ بڵێی، یوسف چووبا ئەو کەین و بەینەی ورد و باریک لە بۆ باوی گێڕاباوە؟ کێ دەیزانی. ئیدی بە جارێ تۆقیبوو و لەوانە بوو ترس هەموو شتێکی پێ کردبا. یوسفی وەکو سامێک، ترسێکی قووچاو لە ژووری بەجێ هێشت و ڕۆیی.

بناخەی کۆشک و سەرا لە ڕاستانەکەی چمکی باشوورەوە، لەسەر ڕەقەنێک ڕۆنرابوو. ژێرەوەی هەڵدێرێک بوو و لە هەڵدێرەکەڕا پێدەشتێک دەکشا. بە پێدەشتەکەدا شارێ و شەقامی گەورە گەورە و بەرین دەڕۆیی. شاری بایزید لە سەرەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ قەدپاڵی ئاگری بە خانوویەرەی گڵەوە هەڵکشابوو. ئاورینگ و بڵێسەی دووکانەکەی حوسۆی ئاسنگەر لەسەر کەوریێکی زەلامەوە هەموو شەوێ دەوروبەرانی ڕوون دەکردەوە و تا بەربەیان ئاورینگ و پریشک تۆپەڵ تۆپەڵ لە دەرکەی دووکانەکەوە دەردەپەڕییە نێو تاریکاییێ. هەندێ جار ئاورینگ وەکو سێلاو بە درێژاییی شەوگار بە نێو



حوسۆی ئاسنگەر ئاسن دەکوتێ

تاریکاییدا دەکشا. مەحموودخان شەوێکی کەیفی ساز با لە پەنجەرانڕا، تەماشای ئەو ئاورینگ و پریشکانەی دەکرد کە لە دەرکەی دووکانەکەی حوسۆوە دەرژایە نێو تاریکاییەوە. نەدەزانرا تەمەنی چەندە. لە دووکانەکەیدا لەگەڵ هەر پێنج کوڕەکانیدا شیری زۆر جوانی زێڕکوتی تیژی قایمیان دروست دەکرد. حوسۆ لەوەتی خۆی ناسیبووەوە هەنگاوێکی نە بەرەو دەرکەی ماڵە پاشای و نە بۆ ماڵە ئاغا و بەگان هەڵنەهێنابووەوە. ڕەمەزانان ڕۆژووی نەدەگرت، نوێژی نەدەکرد، قەتی دوعا نەدەکرد. هەندێ دەیانگوت ئاگر دەپەرستێ. هەندێ شەوان کوورەی خۆی دەدەماند، دەدەماند، تا نێو دووکان و بەردەرکە پڕدەبوون لە پریشک و ئاورینگان، هەنگێ لە پێش ئاگری دەهاتە سەر چۆکان و دەستی لە ئاگرەکە پان دەکردەوە.

حوسۆ هاوین با، زستان با، هیچی وای لەبەر نەدەکرد. تەنیا شاڵێکی ئەستووری بەبەری خۆیەوە دەپێچا و پشتێنێکی سووری لە پشت دەبەست.

گوڵبەهار بە نائومێدییەوە لە پەنجەرانەوە تەماشای کرد. شاری هەموو لە شیرنی خەوێدا بوون. ئاورینگ و پریشک لە دەرکەی دووکانی حوسۆوە تۆپەڵ تۆپەڵ دەرژایە نێو دڵی شەوگارەوە.

سۆفی لە ناخەوە قووڵا و قووڵ بە بلوێرەکەی تووڕەیی ئاگریی دەژەنی.

لە دوورەوە، لە خوارێ، لە پێدەشتی بایزیدێ ئەسپێک شێت و هارانە، هەراسان و تەنگەتاو تۆڕ و ترووک دەیحیلاند. گوڵبەهار گوتی:

«سۆفی..».

سۆفی بلوێری دانا گوتی:

«گیانی سۆفی».

گوڵبەهار گوتی:

«کەمی ماوە، وا لەسەرتان دەدەن چارەیەک نییە؟»

سۆفی گوتی:

«نییە».

گوڵبەهار گوتی:

«ئەدی ئەگەر تۆ لێرەوە دەرکەوی، بچی ئەسپەکەی بێنییەوە و لە چ سەران نەدرێ.»

سۆفی گوتی:

«نابێ، ئەسپ نایەتەوە، سۆفی بەقوربانی ئەو دەم و دووە شیرینەت بێ».

ئەوێ شەوێ لەگەڵ سۆفیدا ماوەیەک دوو بە دوو پێکەوە مانەوە، نە سۆفی ورتەی لێوە هات نە گوڵبەهار.

پاشان گوڵبەهار گوتی:

«قەت نەبووە و نەکراوە» بە دەنگێکی کز و دامرکاوەوە: «قەت نابێ، زوڵمە، تاوانە، قەت نابێ. ئەم سەرایە ژێر و ژووربێ». ئیدی دەنگی بەجارێ کز بوو.

سۆفیش دەنگە نەرمەکەی خۆی لەگەڵ دەنگە دامرکاوەکەی ویدا تێک ئالاند و گوتی: ئەم سەرایە ژێر و ژووربێ «ئەدی هیچ چارەیەک نییە سۆفی؟ چ دەڵێی بۆ خۆم بچمە چیای؟ بۆ نێو هۆز و وارگەی ئەحمەدی، بڵێم ئەحمەد سۆفی ئەسپەکەی دەوێ».

سۆفی هەڵی دایێ:

«نابێ».

«ئەدی چۆنە بچم بەسەر دەست و پێی باومدا بکەوم، واز لە ئەسپەکەی بێنێ؟»

سۆفی گوتی:

«نابێ شۆخەکەم، نابێ سوڵتانەکەم، بۆ ڕۆحێک ئەوە دەهێنێ؟ سۆفی لە دەوری زارت گەڕێ، کە شەکرانی پێ دەشکێنی و هەنگوین دەدڵۆپێنی. سۆفی بە گاو گەردوونی پۆرت بێ داو زێڕەکەم، سۆفی بە قوربانی ئەو چاوانەت بێ مامز نیگاکەم. سۆفی بەلاگێڕی بەژنت بێ، مراوی گەردنەکەم، سۆفی قەزاوە گێڕی دەروونت بێ لەیل سۆزەکەم. هەناو خەرمانی گڕەکەم. هەموو شتێک چارەسەرێکی هەیە. بەلام تەنیا ئەم مەرگە چارەی نییە. دەک سۆفی بە

قوربانی بێ چارەییت بێ. بۆ تۆ ئاوها چاکترە. سۆفی لە دەوری نائومێدیت گەڕێ».

گوڵبەهار لە ناخییەوە هەڵی دایێ، گوتی:

«ئەمن دەزانم ئاوها چاکترە. دەزانم، بەم درەنگ و زووانە باوم لە سەرتان هەر دەدا. سۆفی کەمی ماوە. بەو زووانە لەسەرتان دەدرێ. منیش دێم لەسەر گۆڕخانەکەتان خۆم دەکوژم. سۆفی دەستم بە دامێنت، کۆمەکێ، یارمەتییەک.»

سۆفی چی دیکەی قسە نەکرد. گوڵبەهار بێ ئەوەی خۆی لەخۆی بگات هەر بە تانیدا چوو. بەڵام بەرد وە جواب هات، سۆفی وە جواب نەهات.

کاتێکی گوڵبەهار لە سۆفی جوێ بووەوە، سۆفی بە بلوێرەکەیەوە نووسابوو، تا سبحەینێ بلوێری ژەنی.

گوڵبەهار لە پەنجەرەڕا نوڕییە تاریکەشەوێ. جارێکی دیکەش سەیرێکی دووکانی حوسۆی کرد. لە دوورەوە، لەو بڵندییە چیای ئاگری گرم و هۆڕی بوو، ناوبەناویش هەناسەی دەدا، شاخ و باڵی دەکرد.

تۆپەڵە پریشکێکی دیکە لە دەرکەی دووکانی حوسۆوە دەرپەڕییە دەرێ، تکایە نێو تاریکە شەوەوە. زرم و هوڕی چەکوشیان لەگەڵ هەناسەی چیادا تێکەڵ بوو.

گوڵبەهار ئۆقرەی نەدەگرت. بە هەموو ئازای لەشیوە، بە مێشکییەوە بە هەموو هەست و نەستێکەوە لە چارەسەرێک دەگەڕا. لە باڵندەی عاسمانان، لە ماران بە هەویای چارە بوو. مشت و دارماڵ دەبوو نەیدەگرت، بۆش و خاڵی دەبوو پڕ نەدەبووەوە. بێ ئەوەی بەرپێی خۆی ببینێ بەو سەرایەدا وێڵ و عەوداڵ بوو. لە نکاو وەبیریدا هات، گوتی:

«ئەم حوسۆیە ئاگر پەرستە. جادووگەرێکە. مرۆیەکی چاکیشە. بەڵکو چارەی ئەو دەردەی پێ بکرێ».

لەپڕ وەدەرکەوت، بەرەو دووکانی ئاسنگەرەکە بەڕێ کەوت. لە تۆی تۆپەڵە

ئاورینگێکەوە نواڕییە ژووری. زوور گەرم و گوڕ داهاتبوو و حوسۆش وەکو هەموو کاتێ لە پشتێنە بەرەژووری ڕووت و قووت بوو. کە گوڵبەهاری دیت، هیچ تێک نەچوو. دەستێکی بە کووره دەمەکەوەی بوو. بە دەم کووره دەماندنەوە لای کردەوە، سەیرێکی کرد. دەتگوت لە مێژ بوو چاوەنۆڕی گوڵبەهار بوو. دەم و چاوی وەگەشە کەوت. کوورەکەی ڕانەگرت. قەدەرێک نۆڕییە ئاسنی نێو ئاگرەکە. ئەنجا ئاسنەکەی، کە وەکو سکڵ سوور دەچووەوە لە چاوەجاغی کووره دەرێنا، خستییە سەر دەزگایێ، بەر کوتکاسنی دا، ئاورینگ پڕ بە دووکانەکە لە ئاسنەوە دەرپەڕی.

حوسۆ پاش قەدەرێک، بە زەردەخەنەوە، گوتی:

«خاتو گوڵبەهار، بەخێرتی».

گوڵبەهار گەشایەوە.

دەنگی زۆر ساغڵەم و دۆستانە بوو.

گوڵبەهار لە پێشان، بەسەرهاتی ئەسپەکەی سەرلەبەر وەکو چۆن ڕووی دابوو بەو ڕەنگی بۆ گێڕایەوە.

حوسۆ گوتی:

«دەزانم».

پاشان هەرچی بە بیردا هات، لە بارەی ئەحمەدەوە، موسا بەگەوە، سۆفییەوە، هەمووی بۆ گێڕایەوە.

حوسۆ گوتی:

«دەزانم».

ئەوجا باسی دڵدارییەکەی لەگەڵ ئەحمەددا بۆ گێڕایەوە.

گوتی:

حوسۆ ئیدی نازانم چت بۆ بگێڕمەوە، چت بۆ نەگێڕمەوە... ئیدی چووە ژێری و دەستی بە بیرکردنەوە کرد.

گوڵبەهار گوتی:

«حەوتووی دادێ، باوم ڕۆژی هەینی لە قەڵایێ لە سەریان دەدا، هیچ چارەیەک نییە؟»

حوسۆ وەڵامی نەدایەوە. هەروا بیری کردەوە، وەستا. پشکۆی نێو چاوەجاغی کوورەکە بەرە بەرە ڕەشەوە بوون، ئاسنەکە ساردبووەوە، وەکو سەهۆڵی لێ هات. حوسۆ لە جێگای خۆی نەبزووت.

لەگەڵ بانگی کەڵەشێران سەری بڵند کرد، گوتی:

«سبەینێ وەرەوە کنم. بەڵکو سەرەودەرەیەکی بۆ دەدۆزینەوە چارەسەرێکی بۆ بەدی دەکەین.»

حوسۆ بەو قسەی چرایەکی لە دڵی گوڵبەهاردا هەڵایسان.

ڕۆژ بە یاڵی ئاگرییەوە نووسابوو کزەبایەکی سوور. سارد تیژ و باریک لە چیاڕا بەرەخوار هەڵی کردبوو، کزەبایەک سارد، وەکو بشکێ، بایەکی بە قرمە قرم.

گوڵبەهار پێی وابوو قەت ئێوارە نایێ. لە پشت پەنجەرەکانی سەراوە، کە دەیانڕوانییە دووکانی حوسۆی ئاسنگەر دانیشتبوو، بێ چاوترووکاندن تەماشای وێندەرێی دەکرد و چاوەنۆڕی بەدیهاتنی پەرجوویێک بوو.

پۆلێ باڵندەی سپی لە دەرکەی دوکانەوە دەفڕین، پۆلێکی دیکەش، نەخێر پۆلێکی تریش، یەکێکی دیکەش. شینایی ئاسمان سپی سپی دەچووەوە. لەپڕ دەرگاکانی سەرا هەموو دەکرانەوە. ئەحمەد و گوڵبەهار لەسەر گۆلی کوویە لە چیای ئاگری، لە نێو هێلانە بڵندەکانی خەرتەلان، دەست لە نێو دەستان خۆیان دەبینییەوە. ڕووبەڕووی یەک دەهاتن، دەیاندایە بزە و پێکەنینێ.

ئەوێ ڕۆژێ تا ئێوارە داهات هیچ جۆرە پەرجوویێک لە دووکانی ئاسنگەر وەدی نەهات. گوڵبەهار خۆی لە نێو گڕی توورەیی ئاگریدا سێ جاران دانەنا و بە هەویاوە نەماوە.

کاتێکی ڕۆژئاوابوو، گوڵبەهار ئیتر کاری لە کاران ترازا بوو، حاڵی زۆر

شرِ بووبوو، له دەست و پێیان بەجارێ کەوتبوو. نەیدەتوانی له جێی خۆی ببزوێ. کاتێکی کەڵەشێری نیوەشەوێ بانگی دا گوڵبەهار هێندەی گولۆڵەیەکی لێ بەسەرهاتبوو. به دەسته کوتکێ دەستی به دیوارانەوه گرت، دڵی وەکو دڵی کێشکه لێی دەدا، چووه کن حوسۆی.

حوسۆی کاتێکی کچەی بەو حاڵه دیت، لەبەرخۆیەوه گوتی: «ئەی هاوار هەی، به ڕاستی نەمدەزانی کار بەو ڕادەیه گەیشتووه، ئەو کچه به ڕۆژێ ڕۆحی پێ نەماوه».

حوسۆ هەرچەندی کرد و کۆشا هیچی به هیچ نەکرد. بەڵام گوڵبەهار وای تەماشای دەم و چاوی حوسۆی دەکرد ئیدی، تازه نەدەشیا بڵێ ئەو کاره چاری ناکرێ.

حوسۆ گوتی:

«کچم پێش له ملدانی وان ئەمن چارەیەک بۆ گێڕانەوەی ئەسپەکه دەبینمەوه. بەڵام ئا لەو گوندەی خوارێ، لەسەر کاروانه ڕێیێ، پیری کاروانێک هەیه، ئەتۆ سەرێکی ویش بده و بچۆ خزمەتی».

گوڵبەهار گوتی:

«من پیری کاروان ناناسم، جا خۆ ئەو تکای کەس قوبووڵ ناکا.».

پیری کاروان یەکجار به تەمەن بوو، ردێنه سپییەکەی وەکو بەفری بەر ڕۆژێ هەمیشه دەچریسکایەوه. شەو و ڕۆژ لەسەر پۆستێکی زەلامی ئەستووری کوڵک درێژ دادەنیشت. کۆمابووەوه، هەر هێندەی گولۆڵەیەکی مابوو.

دار کاژێکی بڵندی لەپێش دەرکەی ماڵی بوو. کاژەکەش هێندەی پیری کاروان پیرۆز بوو. بگره لەویش پیرۆزتر بوو. خەڵقی زۆریان له کەشف و کەراماتی کاژەکه و پیری کاروان دەگێڕایەوه. کەمێ بەو لاوه کاروانه ڕێیەکی بەرینی گەوره تێ دەپەڕی. هەموو ڕێیان له عەرەبستانەوه، له تەرابزۆنەوه، له هەموو لایەکی عەنەدۆڵەوه، لێرەکانه یەکیان دەگرتەوه، بۆ ئێران، بۆ توووران،

بۆ هندستان، بۆ چین و ماچین، هەموو بێرەدا ڕەت دەبوون. هەر کاروانچییەک بێرەدا تێ پەڕیبا، هەر کەسێک با، لەهەر تیرەو هۆزێک با، لە کەم کەم، لە زۆر زۆر، چەند دراوێکی بە نێوی نیازەوە لە بن ئەو دار کاژە بەجێ دەهێشت. قەت کەسیش دەستێکی بۆ ئەو دراوانە درێژ نەدەکرد. هەروا لەبن ئەو دار کاژە کۆدەبووەوە و بۆ خۆی دەماوە. تا جێژن دەهات، ئەو دەمی پیری کاروان دەچوو کۆی دەکردەوە، بەسەر هەژار و دەستەوسانانیدا دەبەشییەوە. هیچ کاروانییەک بێ دراودانان بەوێدا تێ نەدەپەڕی. سەدان چیرۆک و بەسەرهاتیان لە بارەی سەرئەنجام و ئاکامی بەسام و ترسناکی ئەو کەسانەوە دەگێڕایەوە کە بێ دراودانان بەوێدا تێ پەڕیبوون.

هەموو شەوێ ئەستێرەی کاروانکوژە بەسەر دارکاژەکەوە تا ڕۆژ هەڵدەهات دەجریوایەوە و ڕێبەریی کاروانی وێڵی دەکرد و بەهاواری لێقەوماو و داماوانەوە دەچوو.

حوسۆ گوتی:

«تۆ من چت پێ دەڵێم وای پێ ڕاگەیەنە. دەبێ؟»

گوڵبەهار چووە ئەوێ، دارکاژەکەی، شیپانەی درکەکەی پیری کاروانی ماچ کرد. دوعا و سەلامی حوسۆی ڕاگەیاندێ. پیر تکای قوبووڵ کرد. چاوە شینەکانی پیری کاروان لە ستێران دەچوون. خۆشی لە کانیاوێکی ساف و ڕوون دەچوو، پاک و خاوێن و بێ خەوش. گوڵبەهار لە بەردەمی وەنیازێ هات و سێ جارانی شان ماچ کرد، گوتی:

«پیرم، سەرقافڵەچییەکم و هاتوومە خاک و پات، سەرقافڵەچییەکم لە چیا و چۆلان وێڵ و سەرگەردان بووم و هاتوومە بەر ئاستانەکەت، ڕێگام لێ ون بووە و چەواشە و سەراسیمە بووم. سەرقافڵەچییەکم لەسەر چیای ئاگری تۆف و وەیشوومە گرتوومی و تۆ فریامان نەکەوی هەمووومان تێک و پێک دەشکێین. پەلەوەرێکی نیوە گیانم و بەسەر چڵێک لە چڵی ئەو دار کاژەی بەرماڵێتانەوە نیشتوومەوە. باڵندەی دڕم وەدووکەوتوون و بێ دەرەتانم. جەرگم هەڵدەکوڵن».



پیری کاروان پاش ئەوەی سەیری ئەستێرەی شبینی
سەر ماڵی خۆی کرد. بیری کردەوە.

حاڵشرپی کچه زۆری کار له پیر کرد. حەیرانی شۆخی و جوانییەکەی بوو، گوتی:

«دەردی خۆتم لەبۆ هەڵرێژە کچم».

گوڵبەهار حیکایەتەکەی سەر لەبەر بۆ ویش گێڕایەوە. پیر دەستی بە نێو ردێنیدا هێنا و ئەندێشە دای گرت. پاشان چاوی بڕیە ئەستێرەی کاروانکوژە کە جریوە جریوی بوو و وەکو کۆمەڵە ئاگرێکی شین بەسەر ماڵەکەوەی هەڵواسرابوو. زۆری بیرکردەوە، هێندەی بیرکردەوە، گوڵبەهاری لەپێش دەم و وەچۆکان هاتبوو و لەشی سڕ بووبوو.

پاشان گوتی:

«برۆ کچم، پێش ئەوەی لەسەری ئەحمەد بدرێ، شتهایەک ڕوو دەدەن. پێش وەی لەسەری سۆفی و موسابەگ بدرێ. ئەستێرەکە لایەکی ڕەش بووەوە، لایەکەی دیکەی ڕووناکە. برۆ کچم خوا بە کامی دڵی خۆت لەگەڵ بکا و بە ئاواتی خۆت بگەی، بچۆ بە ئاسنگەر بڵێ بیرێک لە چارەسەری ئەسپەکە دەکرێتەوە. بچۆ پێی بڵێ وێروە بێ».

گوڵبەهار لەوێ جوێ بووەوە. سەری گێژ بووبوو. ئەو تروسکە ئاواتەی لە دڵیدا بوو نەختێ گەشاوە. هەستا چووە سەرایێ، دەستی بە چاوەنۆڕیێ کرد. بەڵام بە جارێ شاگەشکە بووبوو، خۆی پێ نەدەگیرا. بڕوای بە پیر، بە ئاسنگەرەکە، بە دار کاژەکە، بە ئەستێرەی کاروانکوژە، بڕوای بە هەموان بوو. باویشی تا دەهات، تا ڕۆژی لەسەردانێ نێزیکتر دەبووەوە، هێندەی دیکە رکی پەرەی دەستاند و وە حەوزەڵ دەکەوت. کەسی لێ نێزیک نەدەکەوتەوە، کەسی نەدەدوواند.

بە تاقی تەنیا، لەو کۆشک و سەرایەدا، بۆڵۆنێک، قرەیەک بووبوایە هەر لە خۆڕا هەڵدەچوو و بە جارێ هار و شێت دەبوو. ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، گوێی داقوویابوو پشتی کۆم بووبووەوە. ئەوەی پووکاندبوویەوە، ئەوەی بەو دەردەی بردبوو، شتهایەک هەبوون لەو کارەدا کە پەڵەی ئاویتبا سەر شەرەف

و ئابرووی، بەڵام چی بوو؟ بۆ خۆشی نەیدەزانی.

گوڵبەهار ئیدی دەترسا سەر لە زیندانێ بدا. مەمۆش وەکو ناساغێک، نەخۆشێک، بێ چارەیەک، بەو پەڕی ڕووخۆشی و دەم و دووێکی خۆشەوەی دەعاملاند و بەو حاڵەوە هەموو شتێکی لەبن پێی نابوو و پەروای بە هیچ نەمابوو. مەمۆ لە هەموو هەڵس و کەوتێکیدا، خوو و ڕەفتاری خاوەن بەهرەیەک، خوا پێداوێکی لە دنیا وەڕەز، لە خۆبووردووی تێدا بەدی دەکرا. نیگایەکی سۆزاویی هێند خەماوی، هێند نائومێدانە، هێند قووڵ لە چاوەکانیدا پەنگابووەوە، کە لە چاوی هیچ کەسێکی دیکەدا، بگرە لە چاوی هیچ مرۆیەکی دیکەدا نەیدیتبوو. نیگای بەردی، ئاسنی دەسمی، جەرگی پیاوی دەبڕی. خەم و خەفەتی هەموو دنیا، خۆشی و شادیی هەموو دنیا لە چاوی ئەم پیاوە روخسار وەک ئی خاوەن بەهرەیەدا قەتیس مابوو. گوڵبەهار لەوێ شەوێوە زۆری بیر لە مەمۆ کردبووەوە. هەر ڕاسپێرییەکی پێ ڕاسپاردبا بەو پەڕی ملکەچییەوە، وەکو جادووی لێ کرابێ، بۆی جێبەجێ دەکرد و زۆر بە ڕەزامەندی و بەختەوەرییەکی بێ سنوورەوە. گوڵبەهار لەو بڕوایەدا بوو ئەگەر گوتبای مەمۆ ڕۆحی خۆتم بۆ دەرێنە، مەمۆ لە خۆشییان شاگەشکە دەبوو. مەمۆ بەنگی بوو؟ سۆزاوی و عاشق بوو؟ ئەگەر واشبا لەوانە بوو بە ئەحمەدی گەیاندبا و بەوپەڕی شادیشەوە؟ شادی و خۆشیی گەورە، کوڵ و کەسەری گەورەی دنیا، لە پێستییەوە لە چاوییەوە، فیچقەی دەکرد.

«مەمۆ، مەمۆی خزممان، تا مردن قەت ئەو چاکەیەت لەبیر ناکەم، تا ئەو ڕۆحە لەو بەدەنەدا مابێ، قەتت فەرامۆش ناکەم».

گوڵبەهار بێ ئەوەی خۆپیشانی مەمۆ بدا، لە پێش دەرگەی زیندان وەستابوو.

شەو بوو. ئاورینگ تۆپەڵ تۆپەڵ لە دەرگەی ئاسنگەر دەردەپەڕییە نێو تاریکاییی شەوگارەوە. ستێران، بەو شەوی وا ساف و سامالەی چیای ئاگری، ورد و درشت بە ڕووی ئاسماندا پەرش و بڵاو بووبووەوە. دنیا کپ و کشومات بوو. تەنانەت سرووەی کزەبایەکیش نەدەهات. گوڵبەهار، بە

شەونخوونی، ڕۆژی لە بەر پەنجەرە کردەوە. لەگەڵ گزنگی ڕۆژێ، لە خۆشییان دڵی هاتە سەر لێوان. ئەسپێکی ڕەخت و زینکراو لە پێش دەرکەی دووکانی ئاسنگەر وەستابوو. زۆری نەخایاند، ئاسنگەر لە دووکان وەدەرکەوت سواری ئەسپەکە بوو و ڕێ و ڕاست بەرەو چیا هەڵکشا. گوڵبەهار دەیزانی بۆ کوێ دەچێ؟ لەوەدا دوودڵ بوو کە ئەسپەکە دێنێتەوە.

دەنگ و باسی ئەوەی کە حوسۆ بە مۆری پیری کاروان چووبووە چیای، ئەسپەکە بێنێتەوە لە سەرانسەری ناوچەکەدا بڵاوبووەوە. چیای ئاگری بە جارێ وەخۆشی خۆشیێ کەوت. حوسۆ بێ و مۆری پیری کاروانی پێ بێ و بۆ چیاییانی بردبێ و بە دەستی خاڵی بگەڕێتەوە شتی وا نەدەبوو و نەدەکرا. ئەوەی دژی مۆری پیری کاروان وەستابا و کەڵەوەکێشییەکی کردبا، ڕووی بە خاکی بەر پێدا نەسووبا لە داکی خۆی نەبووبوو و لەو دەورو بەرەدا نەهاتبووە دنیاوە. بەگە کوردەکان باوی موسابەگ، هەر کە خەبەریان بیستەوە، کەوڵە بزنیان لەبەر هەڵکێشا، کڵاوی لوایان لەسەر کرد، لەگەڵ سوارەکانیاندا داوەرینە نێو شاری بایزیدەوە. هەموو دڵخۆش و شاد بوون. بەڵام کەسیش لە سۆنگەی ئەو کارە نەدەگەیشت. باشە پیری کاروانێکی هێندە گەورە و مەزن چۆن خۆی لەو کارە وەردابوو؟ سەبارەت بە ئەسپێک لە ملدانی سێ کەسانی لە کوێ بیستبووەوە؟ پیری کاروان چ پێوەندییەکی بەو دنیایەوە، بە کاروباری ئەو دنیایەوە نەبوو.

هێشتا سێ ڕۆژی مابوو لە سەریان بدەن. هاتو حوسۆی ئاسنگەر تا ئەوێ ڕۆژێ نەگەڕاوە؟ ئا، ئەوە بوو شادی و خۆشی لە بینیاندا تاساندبوو و بە جارێکی سەر و دڵ گرتبوون.

مەحموود خانیش ئەو خەبەرەی بیستەوە. لە ڕکان شێت و هار بوو. هەرچی بە زاردا هات، لە پاشملە، گوتییە پیری کاروان. جا چەندی مابوو بۆ ڕۆژی هەینی؟ جگە لەوەش چیاییەکانیش وەنەبێ ئەسپەکەیان بداباوە. ئەو گورگە دڕانە نەکو هەر مۆرەکەی پیری کاروانیان نەدەناسی، بۆچی خۆشی چووبا ئەسپەکەیان دەداوە. ئەوا داشیانەوە.



حوسۆی ئاسنگەر ئەسپەکە لە چیای ئاگری دێنێتەوە و
لە پێش دەرکەی سەرای پاشادا دەیبەستێتەوە

مەحموود خان لەسەرا ئەستوند مەڕمەڕە ڕەنگاو ڕەنگەکەیدا هەر دەهات و دەچوو دەیقیژاند:

«جا با بیشیهێننەوە، با بیشیهێننەوە، ئەسپەکەم لەپێش دەرکەش بۆ ببەستنەوە، خوا نابێ بە دوو، ڕۆژی هەینی سەریان لەسەر بورجی قەڵاتێ دەپەڕێنم. لاشەکانیشیان داوێمە بەر سەگان. ئەوانە کەسانێکن بۆ ئەسپێک سەریان لە دژی عوسمانلی ڕاست کردووەتەوە. لەگەڵ تاریک و ڕوونان دەبێ خوێنیان بڕێژرێ، خۆ یەکجا نا، ئەو مەندەبوورە، ئەو یاخییە، ئەو سۆفییە تەمەن هەزار ساڵە.»

لەنکاو حوسۆ ئێوارەی پێنج شەمە ئەسپەکەی هێنایەوە، بە دەرگانەی گەورەی سەراوەی بەستەوە. شنەی جێژنێک لە هەموو کووچە و کۆڵانی شار هەڵی کرد. هەموو کەسێک خۆی بە بەرگی جوان و پەرداخ پۆشتە کردەوە. ژنان خۆیان لە تەل و ئاڵا و واڵا دا.

گوڵبەهار لە خۆشییان شێت و شاگەشکە بوو. بێ ئەوەی بیر لە حاڵی مەمۆ بکاتەوە، یەکسەر ڕای کرد بۆ کن ئەحمەد، هیچ هەستی بە گۆڕان و ڕەنگ پڕووکانی مەمۆ نەکرد. چاوە ڕەشە جوانەکانی بە کوڵ و کەسەرێکی کارییەوە بە قووڵدا چووبوون. نیشتبووە نێو تەنیاییەک. لەو دنیا بێ سەر و شوێنەدا، وەکو بە تاقی تەنیا وەمەلە کەوتبێ وابوو. کاتێکی کلیلەکانی بە زۆر، بە بێ حاڵی، لەبەر پشت دەرێنان و دانی بە گوڵبەهار، دەتگوت دەستەکانی نەماون. کلیلەکان لە خۆڕا، کەوتنە نێو دەستی گوڵبەهار. مەمۆ قاچ و قولی بەیەکدا ئاڵان و بەرەو دەرکەی سەرایێ چوو. کە لە دەرکەی سەراوە چاوی بە ئەسپەکە کەوت نەختێ بە خۆیدا هاتەوە. ئەسپەکە لە وێندەرێ بەستراببووەوە، وەستابوو، سەری بڵند کردبوو، بۆنی بە شەوگارەوە دەکرد. لەوەتی گەڕابووەوە کەسی تخوون نەکەوتبوو. ڕەخت و زەمبەری بەو شەوە، کز کز، دەبریقایەوە. بە چاوێکی دوژمنانەی پڕ سامەوە نۆڕییە ئەسپەکە. خۆی پێ نەگیرابا بە شیرێ سەری لە لەشی جوێ دەکردەوە. ئەو نیازەی هەر لە بیری خۆی نەدەبردەوە، دەستی لەسەر مشتووی شیر، زۆر تووڕە و بە نیازێکی لە

توانا بەدەری کوشتنەوە گلابوو و بە دەوری ئەسپەکەدا دەخولاوە. هەموو لەشی لەژێر ئارەقەدا دەتگوت دە ئاوێ کەوتووە و هاتووەتە دەر، وشکایی بە لەشەوە نەمابوو.

لەسەر بانی زیندانێ لە ژوورە کۆنە بەتاڵەکەی نۆبەداران هەر بە تەواوی لەسەر هەڵدێرەکە، گوڵبەهار و ئەحمەد باوەشیان بەیەکدا کردبوو و شەویش بە هەوری شادی ئەسپێک دایپۆشیبوون. ئیدی بە جارێ بەر سێلاوی ئەوینێکی پاک و ئاسمانی کەوتبوون و لە خۆچووبوون. لە کاتی سەرمەرگدا، دوا دڵداری، دڵداری تەمەنێکیان لە چاوترووکاندنێکدا، لە شەوێکدا پەنگاندبووەوە. خوێنیان لە شادەمارییەکدیدا دەگەڕا. گڕێکی ترسناک، لەشی ڕووتیانی پێکەوە جۆش دابوو. لە شێپانەی مەرگدا نەبووبان، بەو ڕەنگە نەدەبوونە یەک دڵ و یەک گیان، لە سووتمانی ئەویندا، دڵداریدا بەو جۆرە بەیەکدا جۆشیان نەدەخوارد.

مەمۆ سەر لە بەرەبەیانێ، هەرتکانی لە جێگا کۆنەکەی نۆبەدار، لە کەنار هەڵدێرەکە دیتەوە. خۆیان بە فەروە پان و پۆڕە کەوڵە مامزەکەی ئەحمەدەوە پێچابووەوە و ببووبوون بە یەک مرۆ، ئیدی بەو ڕەنگە ڕۆح بە ڕۆحەوە. ڕووناکیی نیوە تاریکی شەبەقیان بەسەردا باری. مەمۆ دەست بە شیری ڕووتەوە، لە هەژمەتان هەموو دەم و لێوی خۆی کرۆشتبوو، سمێڵی هەموو ڕنیبووەوە، دەم و چاوی خڵتانی خوێن بوو.

ڕوخساری گوڵبەهار لەبەر ڕووناکی تاریک و ڕوونان بەختەوەری منداڵێکی تێدا دەخوێندراوە. مەمۆ لەو بەری وەستا، بە سەرسامییەکەوە لە ڕوخساری نۆڕی. ڕک و تووڕەیییەکەی بەرە بەرە نیشتەوە، شیرە درێژەکەی دە کێلان ئاوێتەوە، لەوێ جوێ بووەوە.

دیسان گەڕاوە کن ئەسپەکەی. هەمیسان ڕەگی وەشاخ و باڵان کەوت. بە فێ لێهاتنێکەوە بەچوار دەوری ئەسپەکەدا خولاوە، ئارەقەی شین و مۆری کردەوە، سەرلەنوێ شیری هەڵکێشا. دەست بە شیری ڕووتەوە بەبێ حاڵییەکی شێتانەوە بەرەو هەڵدێری کن سەرا ڕای کرد، چووە خوارێ،

گەڕاوە. هەرچی دەرکە و مەرکە هەبوون هەمووی کردنەوە، دەیویست هەرچی لە سەرادا هەن و نین ملیان بپەڕێنێ. هەرچی گیانلەبەر بوون بیانکوژێ. پێی بەرە و زیندانی بە کێش کرد. دەست بە شیرەوە، دیسان لە پێش دەرکەی زنجە کۆنەکەی نۆبەداران ڕاوەستا. ڕوخساری گوڵبەهار ئەو دەمی ڕووناکتر بووبووەوە. دەمی کردبووەوە، ددانەکانی وەکو ددانی منداڵ بە دیار کەوتبوون، غەمزەکانی هێندەی دیکە جوانتر بووبوون، قژی دەم و چاوی ئەحمەدی داپۆشیبوو. مەمۆ هەر کە چاوی بەو ڕوخسارە کەوت واقی ورما. وای سەیر دەکرد، عومرێک، هەزار ساڵ، لێی تێر نەدەبوو. بەڵام دنیا لە ڕۆژبوونەوەدابوو، هێندەی نەمابوو وەخەبەر بێن. مەمۆ وێستاکە، کە بە سەرسامییەوە دەینۆڕییە گوڵبەهار، لەو بیر و خەیاڵی شەوێ کردبوونییەوە شەرمەزار بوو. هەر سەیری دەکرد و سەیری دەکرد، سەروسیمای وەکو جارێکی دیکەی نەبینێتەوە، بە جۆرێ لە بیلبیلەی چاوانی نەخش دەکرد کە قەت کوێر نەبێتەوە. مەمۆ نەرم بووەوە، دامرکاوە، شەرمەزار بوو، دیسان فێی لێ هات. پاشان چەند جارێک دیسان گەڕاوە زنجەکە و لە ڕوخساری گوڵبەهار کە تا دەهات گەشتر و جوانتر دەبووەوە، سەرسام بوو.

گوڵبەهار ئاخرییەکەی وەخەبەر هات، ئەوەی بەو بەرەبەیانە بە شیری ڕووتەوە هاتبووە سەریان دیتی و لێشی ڕوون بووەوە کە مەمۆیە و نیازی چییە، نەختێ پتری خۆ خزاندە باخەڵی ئەحمەدەوە. ئەو کارە بەو ڕەنگە ببڕێتەوە چاترە. ئەحمەدیش چاوی بەو شیر بەدەستە کەوت، جووڵەی نەکرد. ئەویش خۆی خزاندە باخەڵی گوڵبەهارەوە، گوتی: هەر بەو ڕەنگە چاترە، خۆ کارەکە بێ ئەنجامە.

هەناسەیان لەبەر خۆ بڕیبوو. شیرەکە لەبەر ڕووناکیی شەبەق وەکو دڵۆپە ئاوێک بە هەواوە قەتیس مابوو، چاوەنۆڕ بوون، ها ئێستا، ها نەختێکی دی بەسەریاندا بەر دەبێتەوە. مەمۆ سێ جارانی شیر بە هەموو هێزێکییەوە لە هەر دوو دڵدار بڵند کرد، بەڵام دەستی نەیهێنا دای وەشێنێ. مەمۆ دەیبینی چۆن لێک ئاڵابوون و چۆنیان بەو ڕەنگە چاوەنۆڕی مردن بوو.




مەمۆ بە شیری ڕووتەوە بەسەر گوڵبەهار و
ئەحمەدەوە وەستاوە.

مەمۆ دیسان بەرەو دەرکەی سەرا چووەوە زگ ئەسپەکەی، دیسان شیری هەڵکێشا. نۆرەداران نۆرەیان دەگۆڕی. شێتانە بە شیری ڕووتەوە چاوی پەڕیبووە تەوقی سەری، بە تاو جارێ هەڵی دەکوتا سەر ئەسپەکە و جارێ دەگەڕاوە زیندان و هەروا دەهات و دەچوو بریسک و باسکی چەخماخەی لە شیرە درێژەکەی دەپڕژا. لە ناکامدا شیرەکەی بە بەردە چینکە شینەکانی زیندانێدا کێشا. سەرا، هەموو شاری بایزید، تێکڕا گوێیان لە زرینگانەوەی شیرەکە بوو. شیر هەپڕوون هەپڕوون بوو، هەر ڕێزەیێکی بۆ لایەکی پەڕی.

ئەنجا هاتە کولبە کۆنەکەی نۆرەداران. نەختێکی دیکەشی مات و سەرسام نۆڕینێ. ئیدی بە جارێ کەف و کوڵی نیشتبووەوە و بە جارێ گەیشتبووە مەقام و پلەی پیاوچاکان.

بەبێ ئاهییەکەوە گوتی:

«وا ڕۆژ بووەوە، ئەم خەوە بوو بەچی؟»

ئەوان خزابوونە نێو باوەشی یەکەوە و هێشتا چاوەنۆڕی ئەوە بوون کەنگێ کارەساتەکەیان بەسەر دێ.

مەمۆ گوتی: «دنیا ڕۆژە، هەڵستن، با یەکێک نەتانبینێ. خێراکەن». ئیدی چووە دەرێ.

هەردوو دڵداریش لە ژێر هەوری ئەوینی زێڕین وەدەرکەوتن. گوڵبەهار بەرەو دەرکەی سەرا رای کرد. ئەسپەکە لەوێ بۆ خۆی جوان جوان راوەستابوو. زێڕ و زەبەند و زێو و زەمبەر و سوورمەی ڕەختەکەی لەگەڵ بریسک و باسکی تیشکی ڕۆژدا وەجونبوش کەوتبوون و دەچریسکانەوە.

گوڵبەهار بەرانبەر ڕۆژی تازە هەڵاتوو، بەو پەڕی بەختەوەرییەوە قەدەرێ کێشی باسک و باهووی خۆی دا.

وا ئەسپ گەڕاوە، ئیدی ئەحمەد دەڕوا، ئیدی جارێکی دیکەی قەت قەت نەدەبینیەوە، بەختەوەری تەواوی عەمرێک دەو دڵدارییە تەمەن کورتەدا دەبڕاوە. سەرانسەری عەمرێک، گڕ گڕ، بەو تەنیا شەوەوە گیرسابووەوە و

تامی هەر ئەوێ شەوێ ژیابوو.

گوڵبەهار گوتی:

«زۆر شوکوور بۆ ئەو ڕۆژە هەڵاتووە، زۆر شوکوور بۆ ئەو چیا بە بریق و باقە، زۆر شوکوور بۆ خوڵقێنەری، بەسە ئیدی، ئەمە زۆرە. زۆر شوکوور ...»

ڕۆژ هەڵاتبوو، هێندەی منارەیەک بڵند بووبووەوە. بەگە کوردەکان بە شادییەوە، گران گران، قیت و قۆز، شیری درێژ درێژ و زەلام و زەلامیان بە بەر پشتەوە، یەکە یەکە، دوو دوو بۆ سەرا دەهاتن. هەر کەسێک دەهات خولێکی بە دەوری ئەسپەکەی پێش دەرکەی سەرادا دەخوارد و ورد و باریکیان بەچاو دادەبێژا، ئەوجا زۆر بە سەرگرانی و سەلارانە و ڕێزەوە لە ئەسپەکە هەڵدەبڕان و دەچوونە ژوورێ بۆ نێو سەرا.

لە دیومخانی گەورە و بەرینی چەند ئەستوندی سەراوە دەنگە دەنگ دەهات، مەحموودخان ڕەنگی پەڕیبوو. لە ڕکان دەلەرزی، دەیگوت: «ئەو ئەسپە ئەسپی من نییە، ئێمە ملمان لە پێش پیری کاروانێ لە موو باریکترە، بەڵام ئەو ئەسپە ئی من نییە. ڕۆژی هەینی لەگەڵ شیرەی شەبەقدا دەبێ لە ملیان بدرێ».

مستەفا بەگی سەرۆک هۆزی زیلان هەڵی دایێ، گوتی:

«ئەمن ئەسپەکەت دەناسمەوە، پاشا، ئەو ئەسپە ئەسپەکەی خۆتە». ئیدی ئەو قسەیە بەشی هێندەی کرد کە پاشای بە جارێ پێ هار و شێت بێ. «هۆ هۆ، بەگ، بەگ، لەگەڵ توومە. یانە تۆش یەکێکی لەوان؟ دەنا تۆش؟»

بەگەکانی دی گوتیان:

«پاشا، ئەو شتێکی دی مەبەست بوو، ئەتوو بە پێچەوانە تێ گەیشتی».

گوتیان:

«ئەستەغفیروڵا، پاشا، ئێمە خراپمان تێ گەیاندی. تۆ قەت بە پێچەوانە تێ دەگەی؟»

ئیدی بەگەکان کڕبوون، جارێکی دی زمانیان هەڵنەهێناوە. شادییان لە بین گیرا.

«بەڵێ بەگینە، سبەینێی ڕۆژی هەینی ئەو دزانەی ئەسپەکەیان بردووم و تا ئێستا بۆیان نەگێڕاومەوە لەگەڵ شیرەی شەبەقدا، لە برجی قەڵایێ، لە پێش چاوی هەموو دەستـدا و تەبەعەی عوسمانلی لە سەریان دەدرێ. هەر ئێستاکانێ جارکێشان وەنێو کووچە و بازاڕی دەخەم بانگ ڕایەڵن و جاڕان بکێشن».

بەگە کوردەکان دەستەو سینە، بە دڵ و دەروونێکی پڕ لە نیازی سەرکێشییەوە، لە سەراوە هەرەسیان هێنا، وەدەر کەوتن. دیسان بە دەوری ئەسپەکەدا سەر و خولیان خوارد و بە چاو ورد وردیان بێژا، گوتیان:

«ئەمە ئەسپەکەی خۆیەتی، وەڵڵا وە بیللا خۆیەتی، ئەوە دروشمەکەی، ئەوە رەخت و زینەکەی، هەموو خۆیەتی».

«باشە سەبارەت بە چی پاشا لەم سێ پیاوە ئالاوە و بە رکدا چووە؟ لە سۆنگەی چی لە سەریان دەدا؟»

پاشان گوتیان:

«با لەسەریان بدا، خۆ تۆڵە بۆ ڕۆژی قیامەتێ هەڵناگیرێ».

هەموو بە یەک دەنگ، نرکاندیان:

«هەڵناگیرێ».

دوایی هەموو شار بەو کارە حەسیا. جارکێش جاڕیان بە هەموو کووچە و بازاڕاندا ڕایەشت، نێو و تاوانی ئەو کەسانەی لە ملیان دەدرا ئاشکرا کرد.

حوسۆی ئاسنگەر لە داخان شێت و هار بوو، کوتکاسنی بە دەستەوە، وەکو تۆپەڵی تووڕەیی و ڕک هاتە بەر دەرکەی سەرایێ قیژاندی، گرماندی:

«ئەمە زوڵم و بێ دادییە پاشا، ئەمە ستەم و زۆرداریيە، ئەم بێ دادی و زۆرداریيەت هەر وا بۆ بەسەر ناچێ. هەر وا درێژە ناکێشێ. ئەسپ ئەسپی خۆتە پاشا. ئەتوو شایانی ئەو ئەسپە نی، بەڵام ئەسپی تۆیە. من درۆ ناکەم، ئەمن بە دەستی خۆم ئەسپەکەم هێنایەوە پاشا، ئەسپ ئەسپی تۆیە».

پاشان چوو دەستە ڕیشمەی ئەسپەکەی لە ئاڵقەبەندی دەرکەی سەرایێ

ترازاند و لێی گەڕا، گوتی:

«تۆ شایستەی ئەو ئەسپە نی پاشا. تۆ شیاوی مرۆڤایەتی نی پاشا ... تۆ، تۆ، تۆ، شیاوی نی ...»

ئەسپەکە سەربەخۆ وەنێو شاری کەوت، ماڵ بە ماڵ، دووکان بە دووکان هەموو بایزید گەڕا. پاشان گەڕاوە مەیدانێ، سەری بڵند کرد، کونە کەپووی کردەوە، تا توانی بۆنی بە هەواوە کرد، ئینجا بە هەموو توانستیەوە حیلانێک حیلاندی ئەرز و ئاسمانی هێنا ناڵە و گریان. ئاگری دەنگی دایەوە. ئەسپی گۆرین کلکی ڕەپ کرد، یەک دوو جاران وەکو بیەوێ بفرێ، وەشاخ و باڵان کەوت. پاشان بەرەو چیا ڕێ و ڕاست دای کێشا و وەکو ئەستێرەیەک کشا و لەگەڵ ئاوا بوو.

ئەوانەی گوێیان لە حیلەی ئەسپەکە بوو، گوتیان:

«ئەم پاشایە لە ڕەگ دەرنایە و نابڕێتەوە».

میرغەزەبان بیورە گەورە و گرانەکانیان لە هەسان دەدا و خۆیان بۆ سبەینێ ئامادە دەکرد.

گوڵبەهار شێت و شوور بووبوو، هەرچەندی دەکرد جێگەی بە خۆی نەدەگرت و لەو کۆشک و سەرایەدا وەکو مردوو تا ئێوارێ خولاوە. هەر کە ئێوارێ داهات و دانەهات، بوو بە شەو و نەبوو بە شەو ڕاست و ڕەوان دای کێشا بۆ دووکانی ئاسنگەر چوو.

حوسۆ بە پیرییەوە هات، گوتی:

«چ بکەین کچم، چمان لە دەست نەهات. ئیدی چی دیکەشمان لە دەست نایێ. پیریش چ ناکا. ئەمنیش چم نەکرد. چارەنووس وایە، چ بکەین».

گوڵبەهار لە ژێرەوە دایە کوڵی گریانێ، لە دڵی خۆیدا گوتی:

«دەرمانداوی دەکەم، ژەهری دەدەمێ. ژەهری مارە بۆری ئاگریێی دەدەمێ. ژەهرێکی دەدەمێ هێندەی چاو بکەیەوە و دایخەی و لەبەر هەتاوڕا نەگاتە بەر سێبەرێ دەمودەست بیکوژێ و هەناسەی لەبەر ببڕێ. نایەڵم بژی».

گەڕایەوە سەرا. لە یوسف گەڕا، دیتیەوە. یوسف هیچی بە هیچ نەکرد؟ بگرە هەر نەشیدواند. سەرەڕای ئەوەش هێند دژمنانەی نۆڕیێ، هێند بە ڕکەوەی تەماشا کرد، گوڵبەهار لە ڕاستی خۆی ڕەق بوو. ناچار غاری دا کن کوێخا دەرەکی. بابی سمایلی کوێخا دەرەکی زۆر خاتر دەگرت، قەتی لە قسان دەرنەدەچوو. سمایل ئاغاش ئاگری لێ دەبووەوە. ئەوجا بڕیاری دا دەست و دامێنی دایکی بێ و بەڵکو دایک و فرزەندی ئەو کارەی جێبەجێ بکا. نەخێر لە دایکیشی نێزیک نەکەوتەوە. هەرچی لە سەرادا هەبوو، هەموو کەسێ، دیوارەکان، ئەستوند و کۆڵەکە مەرمەڕان، ڕایەخ و مافووری کوردەواری، تەنانەت پشیلە زەلامەکانی وانێیش کە چاوێکیان شین و چاوێکیان زەردێکی زێڕین و زۆری خۆش دەویستن هەمووی لێ بووبوون بە دوژمن. دوژمنانەیان سەیر دەکرد. پشیلە خۆشەویستەکەی، کە لە نێو جێگادا بەخێوی کردبوو و چاوی لەبەر ڕوونکایێ زەرد و شین دەچووەوە لە باوەش کرد، بە گریانەوە هاتە دوو، گوتی:

«پشیلەکەم، پشیلە سپییەکەم، چاو زێڕینەکەم. لەگەڵ تۆمە، تۆ لە دەردی من بگە، وا خەریکن ئەو ئەحمەدەی کە لە پرێکدا دیتمەوە و لە پرێکدا ونم کرد دەکوژن، هەڵۆی سەر چیایان، سەودای دڵی من بوو».

ئیدی گوڵبەهار قەدەرێ قسەی کرد و بە تانیدا چوو. پشیلەکە لە باوەشیدا بووبوو بە کلۆڵەیەک میاوە میاو، تا دەهات نوقمی تاریکاییێ دەبوو و سەری بە دیواری ناهومێدییەکدا دەتەقی و بە جارێ گێژ و وێژ دەبوو، حاڵی شڕ و پەرێشان دەبوو.

«سبیانێ لە سەری ئەحمەدی دەدەن، پشیلەکەم. دەیکوژن، گوێت لێیە؟ بەزەییم پێدا دێتەوە، هەناوم دەسووتێ. ئەمنیش خۆم دەکوژم پشیلەکەم».

پشیلە بە باوەشییەوە لە حاڵی خەوڕۆییدا بەرەو دەرکەی زیندانێ چوو. پشیلەکە گەرم و گوڕ، تا دەهات پتری دەمیاواند.

دەرکەی زیندان سارد بوو. مەمۆی وەردیان خۆی بەسەر شیرە زەلامەکەیدا

دابوو، خۆی بە فەروە کەوڵە مامزەکەی کە تا سەرچۆکان دەهات پێچابووەوە. دەم و چاوە درێژکۆڵە جوانەکەی، چاوە ڕەشەکانی، ڕدێنە ئەبەنووسییە لوولەکەی، لە خەم و دڵتەنگیدا نوقم بووبوون.

«ئەمنیش سبەینێ لەگەڵ بەرەبەیانێ، کە لە ملی ئەو دەدەن، خۆم لە هەڵدێرەکەڕا بەسەر لاشەکەیدا داوێمە خوار».

لەخۆ چوو بوو. نەیزانی مەمۆ، ئەو قسانەی بیست یانە، نە.

«مەمۆ، مەمۆ، زۆرت چاکە و پیاوەتی دەگەڵ کردم. جارێکی دیکەشمان بە یەک بگەیەنە.»

پاشان بە پچڕ پچڕ، وەکو بخنکێ، خۆشی نەیزانی چ دەڵێ.

«مەمۆ، مەرەخسی کە، با بڕۆا. مەمۆ هێندەم خاترت لە کن نییە؟»

پشیلەکەی فڕێ دا عاردی، بە دەستی مەمۆوە نووسا، مەمۆ وەکو جادووی لێ کرابێ وای لێ بەسەرهات.

«مەمۆی شیر بەدەست، چاوی ڕەشی دەمنی بلێسەت، قامکی وەکو قەڵەمت، شان و باهووی بەهێزت، بەژنی بڵندت هەن مەمۆ، کەسم مەمۆ. ئەمانە جگە لە پاسەوانی زیندان، لە پاشا مەمنوون کردن بە کەڵکی چ هاتن مەمۆ؟ ئەمانە لە سەرپەڕاندن بەولاوە سوودی چییان بوو مەمۆ؟ مەمۆ، مەمۆ، مەمۆ ئەحمەدی ئازاد کە، چت دەوێ دەتدەمێ».

مەمۆ وای لە ناخەوە نرکاند گوڵبەهار بەخۆدا هاتەوە، لە خەورۆییێ ڕاچەنی و وشیار بووەوە.

«هەرچیم بوێ دەمدەیێ؟»

«چت دەوێ دەتدەمێ، مەمۆ. ئازا و بوێرم مەمۆ! کەسەکەم مەمۆ».

مەمۆ جارێکی دیکەشی پرسییەوە:

«چم بوێ دەمدەیێ؟»

«داوای ڕۆحم کە، ڕۆحمت دەدەمێ مەمۆ».

دووپاتی کردەوە:

«چت دەوێ دەیدەم مەمۆ، چت دەوێ. هەر هێندە ئەحمەد قوتار بێ».

مەمۆ کڕ بوو، چیی نەگوت. چووە ژێری و بوو بە ماستی مەیو. دەم و چاوی لەبەر ڕووناکیی چراکەی، بەختەوەرانە چریسکاوە. پاشان بزەی هاتێ. دەستی درێژکرد، دەستی بەسەر و قژی گوڵبەهاردا هێنا. دڵی نەهات لاقەی کا. گوڵبەهار وەمەراق کەوت: مەمۆ چیی دەویست؟ خۆی گوشیبوو، بە هەموو وزە و هێزی بیر و هۆشییەوە چاوەنۆڕی نیاز و خوازی مەمۆ بوو. مەمۆ دەنگی گۆڕا، بە ڕوویێکی خۆشەوە، بە شادی و خۆشی مرۆیەکەوە سنووری بەختەوەری، بەختەوەری، بەختەوەری شکاندبێ و لە ژیاندا بە هەموو ئاوات و کامێکی دڵی خۆی رەسیبێ، گوتی:

«هەرچیم بوێ دەمدەیێ؟»

گوڵبەهار گوتی:

«دەیدەم».

بە دەنگێکی تێر، پڕ باوەڕ، بێ دوودڵی گوتی:

«دەیدەم».

مەمۆ گوتی:

«چەند داوێکم لە قژت دەوێ».

گوڵبەهار بەبێ بیرکردنەوە، کەزییەکی گرت، لە مستی نا، گوتی:

«شیرەکەت هەڵکێشە، بیبڕە، مەمۆ، گوڵبەهارت لە دەور گەڕێ».

مەمۆ شیرەکەی هەڵکێشا، چەند داوێکی لە سەری کەزییەکەی بڕی لەسەر دڵی دانان.

گوتی شتێکی دیکەشم دەوێ

گوڵبەهار گوتی:

«بلێ، گوڵبەهارت لە دەور گەڕێ»



مەمۆ و گولبەهار تەگبیر دەکەن

«دەمەوێ، گوڵبەهار، تا دەمرم، ئەمشەوە و منی لە بیرنەچێتەوە». گوڵبەهار بە دەستیدا نووسا، مەمۆ خۆی لێ مەرەخەس کرد، چووە زیندان، گوتی:

«ئەحمەد، موسا بەگ، سۆفی، وەخەبەر بێن».

نەنووستبوون، هەڵستانە سەر پێیان. کۆت و زنجیری لێ داماڵین و گوتی:

«لەو دەرکەی خوارێ بچنە دەر. تاوەکو تاریک و ڕوونان دەرفەتتان هەیە، تا ئەو دەمی هەڵێن، ڕزگارتان بێ».

ئەحمەد لەپێش دەرکە گوڵبەهاری دیت، لە باوەشێی کرد.

گوڵبەهار:

«خێرا، خێرا، خێراکەن، هێندەی نەماوە ڕۆژ بێتەوە. دەنا پاسەوانان دەتانگرن».

ئەحمەد گوڵبەهاری بەجێ هێشت، لە دەرکەی خوارێی زیندان وەدەرکەوتن.

هەرکە ئەوان وەدەرکەوتن و وەدەرنەکەوتن مەمۆ لە چاوان ون بوو. گوڵبەهار لێی گەڕا، نەیدیتەوە.

ڕۆژ بووەوە، تیشکی خۆر لە کەل و بەندەنی چیای ئاگرییەوە، لە شاری بایزیدێ، لە کۆشک و سەرای بایزیدێ، ڕەنگ پەڕیو، خەمناک، زات بەزیو، وەسەرەتاتکێیان کەوت.

میرغەزەبان گەیشتنە زیندانێ، بانگیان کرد: مەمۆ، مەمۆ، دەرکەی بکەوە، ئەوانی لەسەریان دەدرێ ئامادەیان کە.

مەمۆ وەکو هیچ ڕووی نەدابێ، کەمتەرخەم، بێ پەروا، بە پێکەنینەوە گوتی:

«ئەوانەم ئەمشەو بەرەڵلا کردن».

میرغەزەبان بڕوایان نەکرد، چوونە ژوورێ، بەلام چ ببینن، ئەوانی بە تەمای لەسەردانیان بوون شتاقیان لە زیندان نەمابوون. دەمودەست ڕایان کرد بۆ کن پاشای. کەین و بەینەکەیان ورد و درشت لە پاشای ڕاگەیاند. پاشا دەستی دا شیرێ، ڕێ و ڕاست بەرەو زیندانێ چوو. سمایل ئاغای کوێخا



ئەو جێی مەمۆ خۆی لێ هاویشتە خوارێ

دەرکی، پیاوەکانی، سەرپەلەکانیشی دەستیان دا شیری، پاشا لە نوواوە و ئەوانیش لەدوواوە، ڕێگای زیندانیان گرتە پێشێ. مەمۆ بە تاقی تەنیا، بە شیری ڕووتەوە بەرەنگاریان بوو، بە پێکەنینەوە گوتی:

«ئەوانە ئەمشەو من بەرەڵلام کردن، توخوا چاکم نەکرد؟ پێم وابوو کەیفت پێ دێ».

پاشا زریکاندی:

«هەی نان و نمەکم کوێرت کا» و ڕای ماشتێ. پیاوەکانی پشتەوەشی تێی ورووکان. بوو بە شەڕێکی توند و بێ ئامان. بەڵام کەس نەیدەوێرا خۆ لە قەرەی بدا. چوار دەوری تا دەهات ئاپۆرەتر دەبوو و شیرڕاوەشێن بێ پشوو ئاڵقەی قەڵەباڵغییەکان هەراوتر دەکرد. مەمۆ تا برجێ قەلایێ، ئەو جێی کە ئەوێ سبیانێ، لەو سەعاتەدا، دەبوو لەسەری پیاوەکانیان بدابا، هات گوتی:

«پاشا، پاشا، لێرەکانە سێ ڕۆژ و سێ شەوانم شەڕ لەگەڵ دەکردن، بەڵام بەکەڵکی چی دێ. من تازە ئەوەی لەسەر دنیایێم وەچەنگ کەوت. بە تێر و تەسەلی ئەو دنیایە بەجێ دێڵم. چەند کەسێکم کوشتووە، فایدەی چی. چەند بەندەیەکی تۆشم کوشتووە، وا نییە؟ بە دوعا لە هەمووتان، بمێنن بەخێر. لەوانی ماون، لەوانی خۆشیان دەوێم، خۆشیان ناوێم سەلام دەکەم».

خۆی لە برجی قەلاڕا هەڵداشتە خوارێ. هەڵدێرەکە فرە تووش و قووڵ بوو، ئەگەر لە سەرڕا تەماشای خوارێت دەکرد لاشەی مەمۆ لە خوارێ هێندەی لاشە جووجکێک، باڵێکی کرابێتەوە، دەهاتە پێش چاو.

لە پێشدا حوسێی ئاسنگەر هاتە سەر لاشەکەی مەمۆ، پاشان کوڕەکانی، ئەنجا ژنان، کچان، فوغانێ وەنێو شاری بایزیدێ کەوت. حوسۆ لەسەرمخۆ لە مەمۆ نێزیک بووەوە، هەنییەی ماچ کرد قولە مستی چەپی قووچابوو و لەسەر دڵی بوو. حوسۆ پری دا قولەمستی بە زۆر کردییەوە. چەپکێ قژی ڕەش وەکو پشکۆیەک، وەکو تیشک لە قولەمستی مەمۆدا کەشایەوە، ڕوون ڕوون بەسەر سەوزەکەدا تکا.

یوسف بە ترسەوە، بە پەژارەوە، وەپاریزی ڕووداوەکان کەوتبوو. چاوی بە هەرێزی خوێناوی کەوت. ئەسپەکە سمکۆڵ و نێسکە و شاخ و باڵی دەکرد. هەموو کەس دەیزانی ئەسپ، ئەسپی باوێتی. باوی بۆچی ئەسپەکەی نەدەویستەوە؟ ئایە باوی ئاگای لە هەموو کەین و بەینێ هەبوو؟ ئاگای لە پێچ و پەنای گوڵبەهار بوو؟ ئایە لە سۆنگەی وی بوو؟

ئەو هەموو شتێکی دەزانی. جا دەبوو نەزانێ؟ ئەو سۆسەی پشتەوەی دەر و دیواری ئەستووری دەکرد، دونگەی کەین و بەینی نەبەدیی دەکرد. گوێی لە بۆ سرتەی دوور رادێشت و دەیبیستەوە. ئەدی وا نەبوو؟ ئاگای لە هەموو کردار و ڕەفتارێکی گوڵبەهار بوو. ئەی مەمۆ سەبارەت بەچی خۆی کوشت؟ لە ترسان. مەمۆ هەڵنەدەهات؟ باشە بۆ کوێ هەڵدەهات؟ چما نەیدەتوانی وەچیای کەوێ، پەنای وەبەر قەلاّی خۆشاب بردبا؟ بۆ هەر کوێ هەلاّتبا، هەلاّتبا، بەلاّم لە چەنگ پاشای ڕزگار نەدەبوو، لە هەر کوێ گیرساباوە بە گرتنی دەدا و پێستی سەری دەگوروو.

جارێکیان یوسف منداڵ بوو، کابرایەکیان لە مەیدانی شارێ بەرو پشت سواری کەرێک کردبوو. یەکێکی چاو پڕوپووشاوی، بژۆڵ هەڵوەریو، کە تەنیا پێڵوە سوور هەڵگەڕاوەکانی پێوە مابوو، سەری کەرەکەی دەکێشا. دوو پیاویش لەم دیو و لەو دیوی کەرەکەوە دەڕۆیشتن. یەکیان بیورێکی زەلامی خوێناوی، ئەوی دیکەیان خەنجەرێکی چکۆڵەی بریقەداری بە دەستەوە بوو. هەر وەکو ئەوێ ڕۆژێ بێ وابوو، خەنجەر بە دەستەکەیان پڕی دایە کابرای بەرو پشت سوارکراوی بە گوریس دەست و باڵ شەتەک دراو، گوێی چەپی لە بندا بڕی، ئەوجا ئاوڕێکی پاشەوەی دا و جارێ نۆڕییە گوێکە و جارێ نۆڕییە قەڵەباڵغییەکە و دایە قاقای پێکەنینێ، کابرای تاین لە هەژمەتان پڕ بەو دنیایەی قیژاند و وە پەلە قاژێ کەوت، گوریس لە پەلوپۆی ئالاّ و جووڵەی لێ بڕی، خوێن لە جێگا گوێکەوەی وەکو فوارە فیچقەی کرد. میرغەزەب گوێیەکەی بەسەر قەڵەباڵغییەکەدا توور هەڵدا. گوێی تاین بەڕی تەپ کەوتە نێو دووکانێکەوە. کابرای دووکاندار نۆڕییە گوێکە و واقی لەوی حەلامەتەی وڕ

مابوو. وەکو جادووی لێ کرابێ زەق زەق چاوی بە گوێ خوێناوییەکەدا دووری بوو و نەیدەترووکاند. کەرەکە خڵتانی خوێن بوو. کابرای بیور زەلام بەو بیورە تیژە، وەکو مەڕان کەوڵ کا، پێستی کەرسوارەکەی دەگوروو. کابرا لە تاو هاوار و قیژەقیژ دەنگیشی دەر نەدەهات. هەر لرخە لرخی بوو. قەڵەباڵغییەکی زۆری لە دەور خڕ بوویووەوە. دەم و چاوی ئینسانەکان هیچ سامێکی ئەوتۆی ڕێ نەنیشتبوو. کابرایان دەمەو عەسرانێ هێنا لە بەردەلانی پێش دەرکەی سەرایان فڕێ دا. خوێنی نەدەوەستاوە. سەرانسەری شار، بە خانووبەرەوە، بە دووکانەوە، بە ڕێگا و بانەوە خوێناوی بووبوو. خوێن لە خاک و خۆڵەوە فیچقەی دەکرد. یوسف ئەوێ شەوێ تا سبیانێ ڕشاوە. منداڵانی هەموو شاریش تێکڕا دەڕشانەوە. خوێن کەفی دەکرد. دایکی لە ژوور سەری دانیشتبوو، بۆی دەگریا. هەرچی باوی بوو دەیگوت:

«فێردەبی، ڕادێی، ڕادێی، دنیا لەم تەرزە ژیانە بەولاوە چارێکی دیکەی نییە...»

دایکی بێ وچان دەگریا. یوسف ئەو لە خۆچوونەی لە بیر نەدەچووەوە.

یوسف لەپاش ئەو ڕووداوە زۆری کەرسواری بەر و پشت سوارکراوی دیت. کەچی باکی پێ نەبوو و مووشی پێ نەدەبزووت. لە قەلای بایزیدێ سەری زۆر کەسیان لەپێش چاوی یوسف پەڕاند. زۆر کەسیان لە مەیدانی بازاڕی بایزیدی بە زنجیر حەسیر مەیدان کرد. هەرکە ئەو کارەساتانە دەهاتنە گۆڕێ باوی بە جارێ لەخۆبایی دەبوو، شکۆ و خۆ بەزل زانی دەهاتێ، دەم و چاوی کۆنەپەرستانەتر دەبوو، چاوی وە چریسکە دەکەوت، بەژنی بڵند دەبوو، دەفەی شانی هەراوتر دەبوو و ئیدی دەبوو بە مرۆییەکی دیکە. لەو دەمانەدا دەتگوت خۆی ڕووحان دەدا و خۆی ڕووحان دەستێنێ. باوی لەو دەمانەدا دەتگوت خواوەندێکە کە لە چیای ئاگرێڕا بە هەزار و یەک گرمە و بروسکە و تریشقەوە هاتووەتە خوار. یوسف زۆری لێ دەترسا، باوی باو نەبوو، ترس و لەرزێک بوو بۆ وی.

ئەوێ شەوێ تا سبیانێ نەنووست. تا دەهات ترسی زیاد دەبوو و پەرەی

دەستـاند. گـومـانی لەوەدا نەبوو کـە باوی باسـی ئەسپ هێنانەوەکـەی گوڵبەهاری لەگەڵ دەکاتەوە. چاوەنۆڕی کات و هەلی خۆی بوو. باوی شادی و دوژمنایەتی و رک و توورەیی و ترسی خـۆی، بێ باکـانە، لەکن کـەس نەدەدرکاند.

بیری کردەوە گوتی: ئەگەر لێرە هەڵدێم، دەڕۆم پەنا وەبەر قەڵای خۆشابێ دەبەم، بەسـەر دەست و پێی بەگی خۆشـابدا دەکـەوم، دەڵێم مـەمـدەوە باوم، نەخـۆ ئەگـەر نامـحـاوێنییـەوە لەو چۆڵ و جـەولانگای خـوارێی مـامـزی چاوڕەشـانم، بەرهەڵدا بکە، بەگـیش لە باوم دەترسێ، هەمـوو کـەس لە باوم دەترسێ، شای ئێرانێ، پادشای عوسمانلییێ، هەموو کەسێ، هەموو کەسێ لە باوم دەترسێ. مەگەر بە تەنێ مەندەبوورێکی وەکو گوڵبەهار، یانە حوسۆی ئاسنگەر، یا پیری کـاروان. تەنانەت پیری کـاروانیشی لێ دەترسێ. تەنیـا کەسێکی لێ ناترسێ.

یوسف سـبـەینێی بە هەزار حـاڵ کـردەوە. هـاتو باوی پێی زانی، گـوتی: تۆ وەرە وەرە کـوڕی کـوڕئاسـاییت لێ ئاسێ ببێ و ڕاسـتـیت پێ نەڵێ، جـا خـۆ مـردنم بۆ چاکـتـرە. هەنگێ یا دەبێ ئەو کـوڕە لە ناوەندی بازاڕ چاوی هەڵکۆڵدرێ و پێسـتی بگووردرێ و بکرێ بە پەندی زەمانە، یا دەبێ من خۆم بکوژم.

ئەگـەر ڕۆژ بووەوە یوسف هەر بە جـارێکی زەندەقی چوو. لە دڵی خـۆیدا دەیگوت: هـا ئێسـتـا، هـا قـەدەرێکی دیکە مـیـر غـەزەبان دێن پێلم دەگـرن، دەمبەن، ها ئێستا.

وەتاغێکی چکۆلەی تەسک و ترووسک لەکن کیلەرێ بوو، بەحـاڵ جێی سێ کەسانی بە قیتی و تێک خزانەوە تێدا دەبووەوە. لە پڕ خۆی تێوە خزاند. گوێی ڕاداشت، ئێستا دەگەڕێن نایدۆزنەوە، پاشان سواران وەڕێگا و بانان دەخەن و دەڵێن، کوڕی پاشا هەڵاتووە، دنیا دەشڵەژێ، دەشڵەقێ، دمگۆ، مقۆ مقۆ بڵاودەبێتەوە، بەزم، بالۆرە. بە مچوڕک پێداهاتنەوە لەوێ ماوە. دڵۆپە تیشکێک لە درزی دەرکەیڕا دەتکایە ژوورێ.

تیشکەکە ڕەنگی پەڕی، کەم بووەوە، پاشان لەگەڵ تاریکاییەکەدا تێکەڵ بوو. یوسف ئاهێکی هەڵکێشا. ئەوڕۆشی بەرۆک قوتار کردبوو. بەسەر نووکی پەنجەوە لە وەتاغەکە وەدەرکەوت. پیاوەکانی سەرا بێ ئاوڕدانەوە، بە پێش دەمیدا تێ پەڕین و ئیکلامیان بۆ کێشا. یوسف لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەمە داوێکە. داوی باوەە. ها ئێستا دەمگرن. ئێستا. گوێی لە تەپەتەپی دڵی بوو، لە برسان زگی قوڕەی دەهات، خۆی دەمتبەق ئاویت.

بۆنی ئێوارانی بەهار دەهات. هەستی بە بۆنی گولیلکێکی دووری تیژ کرد. پاشان بۆنی گۆشتی سوورەوەکراوە گنجی کەپۆی زووراندەوە. ئەوانی لە متبەقێ بوون لە نکاو ڕاپەڕین، بەرزەپێ وەستان. یوسف قەیرێ هاتوچوو، بەڵام لە ڕووی نەهات داوای خواردنیان لێ بکا و لەوێ نان بخوا. دەنگە نێرە، بە گرمە، پڕ ڕک و کینەکەی باوکی لە دیوەخانەوە بەر گوێ کەوت، بەڵام دەنگەکە لە پڕ، وەکو بە کێرد بیبڕی، بڕا و کپ بوو. یوسف لە ناکاو لە متبەق وەدەرکەوت، هاتە حەوشەی سەرایێ. نۆبەدار لە شوێنی نۆبە گرتنێ بە خۆی و سمێڵە توورەکەیەوە ڕەق وەستابوو، نەدەبزووت. یوسف لەوێرا خۆی ئاویتە مزگەوتێ. وەکو درندەیەکی تەنگەتاوکراو پشووێک لە مزگەوتێ وەهەناسەبڕکێ کەوت، پاشان چووە حەرەمی. دەبوو ورد و درشتی لە دایکی گەیاندبا، بەڵام هەر ئەوەبوو لە برسانیش نەمرێ، دەبوو نانی بخوا.

ئەگەر دایکی دیتی لێی ترسا، قیژاندی:

«ڕۆڵە ئەوە چت لێ بەسەرهاتووە یوسف؟ نەخۆشی؟»

یوسف بە نکە نک گوتی:

«نەخۆشم». ئیدی خۆی دەنوێنێ ئاویت. دەتگوت ئاگرە دەسووتێ. لە خۆ چوو، سێ شەو و سێ ڕۆژان بە دەم تێوە وڕێنەی کرد و بزرکاندی. چەند حەکیمیان هێنایە سەری. حەکیمان چەندیان داوودەرمان دایێ. دەستەکانی قووچابوون، نەدەکرانەوە.

پاش سێ شەو و سێ ڕۆژەی یوسف چاوی هەڵێنا، ئیدی وردە وردە

دەستەکانیشی خاو بوونەوە، پەنجەکانی کرانەوە. پاشان هەڵستا سەر پێیان. هەر دەتگوت مامزێکە و زەندەقی چووە. تا ئێواریێ لە نێو سەرایەدا هات و چوو. چاری ناچار بوو، دەبوو بچووبا کن باوی. هەموو شتێکی ڕاست و دروست لە بۆ باوی ڕوون کردبایەوە. خۆ باویشی ئاگای لە هەموو کەین و بەینێک هەبوو. لەنکاو گوڵبەهاری وەبیرهاتەوە. زۆرزان بوو. دەیزانی باوی هەستی بە هەموو شتان کردووە. کێ دەڵێ ڕێگای قوتاربوونیشی لە بۆ خۆی نەخشە نەکێشابوو. یەکسەر هەڕای کرد بۆ حەرەم، بۆ وەتاغی گوڵبەهار.

گوڵبەهار دانیشتبوو لووشکە لووشک دەگریا، ئەنجا کڕووزانەوە و لالانەوە. یوسف بە جاریێ دین بوو، قیژاندی:

«گوڵبەهار» دەنگی لە گیان و لرخەی سەرەمەرگ دەچوو. دەترسا.

گوڵبەهار بە کەساسییەکەوە پرسی:

«یوسف چییە؟»

یوسف گوتی:

«باوم چاومان هەڵدەکۆڵێ، پێستمان دەگروێ. هەڵی دەکۆڵێ، دەیگروێ، گوڵبەهار».

گوڵبەهار گوتی: «با هەڵێین، کوڕە بە هەموو شتێکی دەزانێ، باشە؟»

یوسف خۆی بەگوڵبەهارەوە نووساندبوو، لە ترسان قاچ و قولی بە یەکدا تێک ئالابوو، چەناگەی دەلەرزی، وەکو سنگ چەقی بوو، دەیگوت: «گوڵبەهار، پێ دەزانێ، با هەڵێین».

گوڵبەهار دەستی دا پیلی لەسەر تەختەکەی دانا، گوتی:

«ڕاوەستە بزانم».

یوسف گوتی:

«بابم خەریکە داوت بۆ دەنێتەوە. نایەوێ بزانی کە ئەو بە هەموو شتێکی زانیوە. نایەوێ بزانی، کە ئەو زانیویە ئەتوو ئەسپەکەت هێناوەتەوە، ئەتوو چوویە دوکانی ئاسنگەری. ئەمنیش بۆ خۆم دیتم کە چوویە ژووریێ لە

دووکانی ئاسنگەرەکە. باوم بەوەش دەزانێ. ئاگای لەوەشە کە ئێستا ئەمن و تۆ، وا دوو بە دوو لێرەکانە پێکەوە قسان دەکەین. هەمووی دیت، دەزانێ. هەڵنەیەین باوم چاومان هەڵدەکۆڵێ. بەو گوێیانەی خۆم گوێم لێ بوو چی بە سمایل ئاغا گوت».

«چی گوت؟»

«دەیگوت: ئەو کچەش و ئەو کوڕەش هەرتکیان دەکوژم. جارێ چاوەڕوانم، بزانم یوسف هەموو شتێکم پێ دەڵێ؟ بزانم گوڵبەهار دێ، بەسەر دەست و پێمدا بکەوێ؟ ئەورۆش چاوەڕوانی دەکەم. سبەینێ قیڕ دەیانگرم.»

گوڵبەهار لە هەموو شتێک گەیشت. خۆشی بەرانبەر بەباوی چەندین ساڵ بوو هەر وای هەست دەکرد. هەموو کەسێ وای هەست دەکرد کە باوی ئاگای لە هەموو گوتە و کردەوەیەکیەتی و لەو هەستە قوتار بوون کارێکی زۆر گرانە. هەرچەندت ئاقڵ بە خەرج دابا، بەڵام ئەگەر جارێکی لە قووڵایی ئەو هەستە کەوتبای ئیدی کارت کرابوو و قوتار بوونت بۆ نەبوو.

یوسف ئەوێ ڕۆژێش نەبا خۆ سۆزی هەموو شتێک، هەرچییەکی زانیبا بە باوی دەگوت، هەنگێ لە ترسان بۆ خۆی هیشک هەڵدەهات و دەمرد. یوسف بە دەستی خۆی نەبوو کە بۆ وێ هاتبوو. هەر لە ترسانیش بوو کە تا ئەو دەمی نەچووبووە کن باوی. گوڵبەهار یەک یەک، بیری لە هەموو شتێ کردەوە. ئەگەر یوسف چووبا مەسەلەی ئەسپەکە و ئاسنگەرەکەی لە باوی گەیاندبا، ئەوە هەموو شتێ ڕاست و ڕەوان ئاشکرا دەبوو و هەڵاتنی زیندانییەکانی لە چاوی ئەو دەزانی و ئەوەی مەمۆشی بە کوشتن دابوو هەر ئاشکرا دەبوو. چا ئەو دەمی باوی بیری لەوە نەدەکردەوە، مەمۆ لە پای چدا ئەوەی کرد؟ لە پێناوی چدا خۆی بە کوشت دا؟

یوسف لە پڕ ڕەنگی پەڕی، گوتی:

«من دەڕۆم» شەقەقەی لە دەرکەوە هێنا، چووە دەرێ، بە هەڕاکردن هاتە بەر دەرکەی دیوەخان، وەکو شێت بە دەستی باویدا نووسا. دوو بەگی کورد،



پاشا مێشکی چەخماخە دەدا

سمایل ئاغا، میراو و دوو پاسەوان لە دیوەخانێ بوون.

گوتی:

«باوە بمبەخشە، مەمکوژە، چاوم هەڵمەکۆڵە. خۆ تۆ بۆ خۆت هەموو شتێکی دەزانی، بمبەخشە، من غەیانەتیم لێ نەکردووی، بمبەخشە.» ڕاست و پاکی لە گوڵبەهار گوت. چۆنی هاتبووە کن، چیی لێ ویستبوو، چوونە کن ئاسنگەر، چوونە کن پیری کاروان، هەرچی بیستبوو و دیتبوو هەمووی بۆ گێڕاوە.

گوتیشی:

«بیگەنێ، گوڵبەهار خەریکە هەڵدێ، کوڕە پیاوی چابن وا هەڵات». لەنکاو مێشکی پاشا چەخماخەیەکی دا، هەموو شتێکی بۆ ڕوون بووەوە. هەرچەندی دەکرد نەیدەزانی مەمۆ لە سۆنگەی چی ئەو غەیانەتییەی لێ کردووە. هەرچەندی دەکرد نەیدەزانی لە داخان لە ڕکان مەمۆی هێندەی کوڕی خۆی خۆش دەویست، شێت و هار بووبوو.

هەردوو باڵی وەکو باڵی هەڵۆ کردەوە، هەستا سەر پێیان، ڕەنگی پەڕیبوو. یەک دوو هەنگاو ڕۆیشت، لەترێکی دا، خۆی بە دیوارەوە نەگرتباوە دەکەوت. دەم و چاوی سپی هەڵگەڕابوو، لێوی وشک هەڵاتبوو. ڕدێنی لەرزی، ئەوجا پاشەوپاش کشاوە، لەسەر تەختەکە دانیشت. دەستی بۆ باغەڵی چوو. ئەوانی لە ژوورێ بوون لە دووی سمایل ئاغا وەدەرکەوتن. یوسف بەجارێ تەواو بووبوو. هەر هێندەی کلۆڵەیەکی مابوو و لەسەر تەختەکە هەڵترووشکابوو.

پاشا گوتی:

«سمایل، سمایل، چمان لێ بەسەرهات؟ تووشی بەڵای نامووسیش بووم؟ ئەم کچە ئەوەشی بەسەر هێنام؟ مەمۆ ها؟ کەواتا ئەم جادووگەرە جادووی لە مەمۆ کرد. کەواتا ئەم کچە تیرە و بنەماڵەی بۆسۆ و بەدناو کردم؟ شەرەفی کردم بە دوو پوول؟ ئەم بنەماڵە زۆری کارەسات و ئۆغرم بەسەرهاتووە، بەڵام سمایل، قەتی شتی وا لێ بەسەرنەهاتووە؟ بێ خەبەر بە داوەوە بووین. سمایل هیزە کەس پێ نەزانێ. دەنا لە نێو وڵاتی عوسمانلی گەورە و گراندا

ڕیسوا دەبم. کەواتا وەها سمایل. بەڵام هەرچەندی دەکەم حاڵی نابم سمایل. نازانم کێ پێکاویە؟ کوشتەی عەشقی کێیە ئەم کچە؟ ئی ئەحمەدە؟ ئەدی مەمۆ؟ مەمۆ؟ مەمۆ؟

مەحموود خان ئیحتمالی دووەمی قەت بۆ قووت نەدەچوو، بە خۆی و کچەکەی ڕەوا نەدەبینی.

هەڵستا، گوتی: «سمایل، نابێ ئەوە کەس پێ بزانێ. بەو دەم و دەستەش کچە لە نێو نابەین».

سمایل گوتی: «نابێ، هەر یەکسەر بە مەمۆوەی دەبەستن».

پاشا گوتی:

«سمایل چ بکەین، هیزە چارەیەک».

سمایل گوتی:

«چارە؟»

پاش کپی و خامۆشییەک، مەحموود خان گوتی:

«وا بزانین نە زانیومانە نە بیستوومانە، چاکە؟»

سمایل ئاغا گوتی:

«ناکرێ، ناتوانین بە هیچ جۆرێکی لەسەرا ڕاگرین، هەڵدێ. یا بە پەنامەکی بیکوژین، یا لە زیندانێی ئاوێین، ئەو بیری عەلی بەگمان تێ ئاوێت.»

پاشا گوتی:

«دەکرێ، بەڵام یەکێکی سەرڕاست و جێ متمانەی لە دەرکە دانێ، دەنا.»

«دایدەنێم پاشا».

پاشا وردە وردە بە خۆدا دەهاتەوە، خوێن ساردییەکەی جارانی وەبەر دەگەڕا. مەسەلەی ئەسپەکە، گۆرانییەکەی سۆفی، هەموو شتێکی لێ ڕوون بوویووەوە، وا پێ دەچوو پێوەندیی ئەحمەد و گوڵبەهار دەبوو زۆر لەوە کۆنتر بێ؟

سمایل ئاغا وەکو با وەدەرکەوت. لەگەڵ دوو کەسان چوونە ژووری گوڵبەهار. گوڵبەهار، پاش ئەوەی یوسف ڕۆیشتبوو، چاوەنۆڕی سمایل ئاغا و میرغەزەبانی دەکرد. بۆ هەموو شتێک خۆی ئامادە و تەیار کردبوو. سمایل ئاغا ڕەق وەستابوو، ئیشارەتی بۆ گوڵبەهار کرد، پیاوەکان پڕیان دایێ گرتیان. سمایل ئاغا لە پێشەوە و ئەوانی دیکە لە پاشەوە، هاتن، هاتن، تا گەیشتنە کن بیری نێو زیندانێ. کەس لە ژووریێ نەبوو.

سمایل ئاغا، چ دریغی لە ڕێز و حورمەت لێنانی نەدەکرد، گوتی: «خانمی ببەنە خوارێ».

گوڵبەهار خۆی چووە خوارێ. سمایل ئاغا دەرکەی بە دەستی خۆی پێوەدا و کلیلەکەی لە کنە خۆی هێشتەوە، گوتی:

«هەردوکتان بە توندی ئێشکی ئەو دەرکەی بگرن، ئەگەر سەرتان چووە ئەو کچەتان لە دەست دەرنەچێ».

پاشا بانگی ژنەکەی کرد، هەموو کەین و بەینەکەی لە بۆ گێڕاوە. پاشان یوسفی پیشان دا، هەر هێندەی چنگێکی مابوو، گوتی:

«کوڕە بە جارێ نەماوە، حاڵی زۆر شڕ و پەرێشانە، تۆ چاکی بنۆڕێ. ئەو کچە لە تۆ بەولاوە کەسی دیکە بە سەروکاری نازانێ. ئەگەر یوسف بە خۆداهاتەوە نسحەتی بکە زاری خۆی بگرێ».

ئەوجا یوسفی هەڵگرت لەکن خۆی داینا. دەستی بە سەروقژیدا هێنا. یوسف وردە وردە بە خۆداهاتەوە.

پاشا دەیگوت:

«ئەتو کوڕی ئازا و بوێری منی. ئازایەکی شایستی بنەماڵەی خۆی بێ وا دەکا، نامووس و شەرەفی بەدناو و بۆسۆ و لەکەدار ناکا.

یوسف بە جارێ شڵەژا بوو و چاوی زەق بووبووەوە، گوتی:

«نامکوژی؟ چاوم هەڵناکۆڵی؟»

پاشا نێوچاوانی ماچ کرد، گوتی:



کۆشکی گوڵبەهار

«یانی چی؟ ئەتوو لە تۆڵەی ئەو پیاوەتی و جوامێرییە دەبێ چەکێکی جوان و ئەسپێکی بە دڵی خۆت خەڵات کەم، گوایە لە سۆنگەی چت دەکوژم؟»

یوسف هەر دەگریا.

پاشا بە ژنەکەی گوت:

«خانم، کورەکە بلاوێنە، لەسەرەخۆی نییە، زۆر ترساوە».

ژنە لە یوسف نەوی، دەستی دا باڵی، لە دیومخانێ وەدەرکەوتن. سمایل ئاغا لە دووی وان چووە ژووری، گوتی:

«پاشام کارەکە جێبەجێ کرا».

پاشان گوتی:

«سمایل ئاغا، کەس سۆسەی نەکا، ها».

«بەسەر هەرتک چاوان پاشام».

«سمایل ئاغا، ئێستا سەرم ئاسوودە بوو. بەراستی سەرم لەو کارە سوور مابوو. بەجارێ گێژ و وێژ بووبووم. ماوەیەکی پێ بچێ، چارەسەرێکی ئەو کچە دەکەین سمایل ئاغا».

«چارەی دەکەین پاشام. کارێکی سانایە. با بەینێکی پێ بچێ، هەموو شت لە بیرکرێ».

سەرەڕای سەروگوم کردن و حەشاردانەوە، پاش ماوەیەکی کەم خەبەری گوڵبەهار لە زیندان ئاویشتن بە هەموو لایەکدا بڵاو بووەوە و بوو بە دمگۆ و مقۆ مقۆ. لە پێشدا کەس بڕوای نەکرد. حوسۆی ئاسنگەریش بیستییەوە. پیری کاروانیش بیستییەوە. ئەوانیش هەر ئەم ئاکامەیان چاوەڕوان بوو. پاشان خەبەرەکە بە سەرتاسەری چیای ئاگریدا بڵاو بووەوە، دواییش گەیشتە کەناری گۆلی وانێ، گەیشتە ئەرزەرۆمێ، قارس، ئەرزنجان. دڵداریی گوڵبەهار و ئەحمەد بوو بە داستانی سەرزاران. خۆشخوان و دەنگبێژان سەدان ستران و هۆرە و لاوژەیان لەسەر هەڵبەست و هۆندەوە. شوان و بلوێر ئەنگێوان چەندین چەند ئاوازیان لەسەر دەرێنان. چیای ئاگری هەموو سەرتاپا خۆی لە

خم نابوو، جەحێڵ و لاوان کەڕناس و مێرخاسان، دلێر و بوێران، کیژە ئەویندار و بەنگییان گوتیان:

«شەرمەزار خۆمان، گوڵبەهار لە بیری زیندانێ بێ. جا ئێمە چۆنمان لە ڕووبێ چاومان لەبەر یەک هەڵبێ».

ئەحمەد، پیری کاروان، حوسۆ، سەرانسەری چیای ئاگری، دەشت و بانووان، پاوان و زۆزنەکانی ئەرزەڕۆمێ شەوەهای شەو خەویان وەچاوان نەکەوت. هەموو بە ئێش و ئازاری ویژدانەوە گلابوون. ڕک، شەرمەزاری، هەر ڕۆژێکی بە ناسۆرێک بوو و تا دەهات تەشەنەی دەکرد.

چیای ئاگری وەکو دنیایەکی دیکەی جیاواز بەسەر ئەو دنیایەوە ڕۆنیشتووە. قورس و گران، بە شان و شکۆ، ئاغڵەبە سەری ئاگری بە تەم و مژە. هەندێ جاریش ئەستێرەی پرش و بڵاو جێگای هەوران دەگرنەوە. بەڵام چ ئەستێرەیەک ئەوانی کە پۆل پۆل لە بۆراندا هەڵدەکەن و دەخولێنەوە. ڕۆژ لە پاش شەوانی دوور و درێژ وەکو خەرمانە ئاگرێکی گەش و سوور لە کەلەکەی چیای ئاگرییەوە هەڵدێ.

چیای ئاگری شەوانە گەورەتر دەبێ، قورس و گرانتر دەبێ. پێت وایە هەموو دنیا بریتییە لە چیای ئاگری و بەس. تاک و تەنیاییەکەی، گرم و هۆڕی بە سام، دای دڕی. لەمسەر تا ئەوسەر. چیای ئاگری لە تەنیاییدا دەکوڵێ، دەجۆشێ. بە شەوی تاریک ناسڕدرێتەوە. تێکەڵ بە شەو نابێ. لە شەو تاریکتر، لە شەو تەنیاتر، بەسەر گەردووندا دەدا. بە مانگەشەویش پرتەوێکی ناسکی ڕوونە، هێند تەنکە ڕادەخرێ، شەوانە بە سامە، تاریکییەکەی هێندەی تۆفە دیوارێک ئەستوورە، لە شەوی ئەنگوستەچاوی بێ ستێردا گرم و هۆڕێکی لە ناخی ناخەوە دێ، هەر دەڵێی لە دوورایی هەزاران ساڵەوە هەڵدەقوڵێ.

تاریکایی وەکو بەرد قورس و گران، وەکو دیوار وابوو، چیای ئاگری وەکو وەسەر پێ کەوتبێ و بڕوا وابوو. دەوروبەر کڕ و کپ بوو. هەر دەتگوت ئەو



جەماوەرێکی بێ ژمار هێرش دەبەنە سەر کۆشک و
سەرا

کرۆکپییەیە کە نەختێ پێش ڕۆژی دنیا خرابوون و قیامەت هەڵستان هەستی پێ دەکرێ، شەوگار، تاریکی، جمان، دەستیان بە ڕێ ڕۆیینێ کرد.

لە پێشەوە ئەحمەد بە سواری ئەسپەکە، لەم دیویەوە ئینسانانی چیای ئاگری، ئەوجا خانوو و بەرە و گوندان، دار و بەرد، هەرچی هەیە و نییە وەکو لافاو هوروژمیان هێنایە سەر شاری بایزید.

هەر لەو دەمی، کەناری گۆلی وانیش وەخەبەر هات، گوندەکانی دەشت و ئارانانیش، ئەوانیش داوەرینە شاری بایزیدەوە. وەکو لە ئاسمانەوە بارین و لەسەر ئەرز بڕۆن، عەشاماتێکی گەورە و گران لەگەڵ شەودا، لەگەڵ چیای ئاگریدا، هەموو پێکەوە بەسەر کۆشک و سەرای مەحموودخانیان دادا.

ڕۆژ بەسەر باڵێکی چیای ئاگرییەوە نیشتبووەوە، لە هەڵاتن و ئاوابوونێدا بوو، مەحموودخان جەماوەرەکەی لە پەنجەرەی سەراوە وەکو تارمایی و خەیاڵ وەپێش چاو کەوت. سوارە، پیادە، کەوڵە بزن، کەوڵە مەڕ، کەوڵە مامز، کەوڵە جوانوو لەبەر، کەڵەکەت و بەژن بڵند، گەنم ڕەنگ، ڕەشتاڵە، مووزەرد و بەڵەک چاو، دەست و مەچەک جوان، کێل گەردن، چاوگەش. جەماوەرەکە وردە وردە، لەگەڵ ڕۆژبوونەوەدا، وەکو لە ژێر تەم و مژێکی هەڵپرینگاو وەدەرکەون، لەژێر داوێنی شەپۆڵ شەپۆڵی شەوگارەوە وەدەرکەوتن. مەحموودخان ئەگەر ئەو قەرەباڵغییەی دیت، چاوی قوچاند، هەڵی هێنا، ئەحمەد بەسەر ئەسپەکەوە بوو. مەحموودخان لە داخان چاوی پەڕییە تۆقی سەری، نۆڕییە ئەم لاو ئەولای خۆی، ویستی فەرمانێ بدا. تەڕاییی لە زاردا نەمابوو. بیری کردەوە. شاری بایزید بە دار و بەردیەوە تێکڕا و سەروبەر ببا بە سەرباز چی لەگەڵ ئەو جەماوەرە پێ دەکرا؟ سەرێکی لە نێزیکی ترۆپکی چیای ئاگری بوو.

جەماوەرەکە هێدی هێدی بەرەو سەرایێ کشان. هەر دەتگوت مێرووڵەن ڕێچکەیان بەستووە، سرتە لە کەسەوە نەدەهات. لە پڕ دەنگی قرچە قرچێک هات. دەرکەی سەرا داڕووخا، جەماوەرەکە ڕژایە نێو سەراوە.
سەلارانە و سەرگرانانە، چوونە زیندانێ. سمایل ئاغا گوڵبەهاری لە بیری زیندانێ دەرێنابوو، لەبەر دەرکەی، بە لەرزە لەرز چاوەڕوان بوو. گوڵبەهار

بەرانبەر بە ڕۆژ چاوی هەڵنەدەهات چاوی هەڵدەگلۆفت، هەر چەندی دەکرد لە ڕووداوەکە نەدەگەیشت. تەنیا هەر هێندەی ئاگا لە خۆی بوو کە وا لە بیری زینداندیی دەریێن. جەماوەرەکە دیسان هەر لەسەرەخۆ و سەرگرانانە گوڵبەهاریان خستە بەینی خۆیانەوە و لەدەرکەی سەرا وەدەرکەوتن.

لەولاوە ئاگرێکی گەورە لە تەنیشت گۆڕی ئەحمەدی خانی هەڵکرابوو، دەروێش و سۆفییان بەسەر کۆز و پشکۆ ئاگردا تەندوورەیان دەکرد، کە هێندەی جێ جۆخینێکی گرتبووەوە. مریدانیش بە دەوروبەری خەرمانە ئاگرەکەدا سۆز و هۆرە و زکریان دەکرد، بلوێریان دەژەنی. جەماوەرەکە هەر بەو سەرگرانی و بێدەنگییەوە ئاڵقەیان لە دەوری خەرمانە ئاگرەکە بەست. سینگ و لاپاڵی چیای ئاگری لەبەر ئینسانان ڕەش دەچووەوە. ئەوانی بەسەر ئاگرەکەدا دەرۆیشتن و تەندوورەیان دەکرد لە دووری دوورەوە دیار بوون. لەشی ڕووتی ئارەقاویی دەروێشەکان لە تۆی کۆز و سکڵ و پشکۆ ئاگری گەش و بە چریسکەوە وەکو ئاوی ڕوون فیچقەی دەکرد و دەردەپەڕی.

مەحموودخان هەر سا نا ساتێ دەیگوت:

«ئەمن ترسنۆکم» و بە شیری ڕووتەوە و بە تەنێ هەڵپەی ئەوەی بوو لە جەماوەرەکە ڕاسێ. سمایل ئاغا و ئەوانی دیکە دەیانگرت و هەرچەندیان دەکرد بۆیان ڕانەدەگیرا.

دەیگوت:

«ژیانی لەمەوپاشم بە کەڵکی چ دێ؟ نێوی عوسمانلیی گەورە و گرانم کرد بە پووڵێکی قەڵب ... لەو دنیایە سووک و ڕیسوا بووم. داخۆ سەرای ئەستەمبۆڵێ ببیستێتەوە چ بقەومێ؟ ژیانی لەمەوپاشم بۆ چییە؟»

بەلام قەڵەبالغی نییە، لە کێشی هیچ هێز و توانستێکدا نییە، ئەم قەڵەباڵغییە قۆشەن و لەشکرانیشی دەرۆست نایە، مەحموودخان ئیدی هەروا لە دڵی خۆیدا لێکی دەداوە و دەیگوت: ئەمە ئەسپ نەبوو، بەلای ناگەهان بوو.

داخۆ ئەم بەڵایە، مەسەلەی ئەسپەکە هەموو خوا کردی؟

جەماوەرەکە تا ڕۆژ ئاوا بوو، لەسەر گۆڕی ئەحمەدی خانی ڕایان بوارد، دەهۆڵیان کوتا، زوڕنایان ژەند، دەروێش و سۆفییان بە لەشی نیوەڕووتەوە، بە پرچی بژی چەتراساوە، بەسەر ئاگردا تەندوورەیان دەکرد، قاچیان دەفڕی و دەستیان لەگەڵ قاچیان تێکەڵ دەبوو، سەمایان دەکرد. کوڕ و کاڵ، کچان، ژنان، بە جوانترین و ناسکترین بارێکی تیرەی ئینسان پەسندی کا گۆوەند و شاییان گێڕا. ڕەشبەڵەک، لە سەت تەرزە و سەت ڕەنگە دەستیان گرتبوو. درێژاییی گۆوەند و شاییەکە، دەهات دەهات تا پاڵی وەسەراوە دەدا، حەوت دەهۆڵکوت و حەوت زوڕناژەن، بە یەک نەوا، دەهۆڵیان دەکوتا و زوڕنایان دەژەند ئەوجا ئەو شایی و گۆوەندە دوور و درێژەیان پێ دەگێڕدرا. ژنان بە مێزەرکی ئارمووشیی نەخشینەوە، کۆمک و کۆفییەکانیان بە پۆیلە و پلپلە و سلسلەوە وەکو تیشکی ڕۆژ دەچریسکاوە.

گۆوەند و شایی و داوەتەکە دەکشا، دەهات، دەهات، وەکو شەپۆلی دەریا شەپۆلی دەدا تا دەگەیشتە داوێنی چیای ئاگری. شەپۆلی داوەت تا دەهات گەورە و بەربلاوتر دەبوو، هەندێ جار چکۆلە دەبووەوە، هەندێ جار وەکەف و کوڵ دەکەوت.

گوڵبەهاریان بۆ ماڵی ئاسنگەر برد. پاک و خاوێنیان شوشت. بەرگێکی کۆنی جوانی لە قوماشی لاهووری ئی وەکو چیرۆک و داستانیان، دەتگوت درووماتی نەدیتبوو، لەبەر کرد. ئەوجا سواری ئەسپەکەی باویان کرد و بردیانە ماڵی پیری کاروان. ئەسپێکی دیکەشیان بۆ ئەحمەد پەیدا کرد.

گوڵبەهار و ئەحمەد نیازیان گرت و شانی پیری کاروانیان ماچ کرد. پیریش ئەوانی ماچ کرد و پیرۆزبایی لێ کردن. کەین و بەینەکەیان، ئەوی مەحموودخان پێی زانیبوو و ئەوی پێی نەزانیبوو، سەرلەبەر، لە پیری کاروان ڕاگەیاند.

پیر گوتی:

«مەحموودخان عوسمانلییەکە، کافرێکە بۆ خۆی. ئەوانە مەخلووقاتێکن، جیاوازن، لە تیرەی ئینسان ناچن. نایەڵێ ئەمەمان بە سەرەوە بچێ. تۆغرم و گوێبەندێکی وەسەر ئاگرییێ دێنێ، ئەو لە کوڕیە و ساوا سەربڕین ناپرینگێتەوە، چ جای شتی دیکە..جگە لەوەش با سنووری داوونەریت لە لای ئێمەوە کەل نەبێ. ئەحمەد ئەتوو هەر ئێستا گوڵبەهار هەڵگرە، ڕێ و ڕاست بچۆ بۆ قەڵای خۆشاب، بۆ کن بەگی. برایمی خەلیفەشمت ڕەگەڵ دەخەم. بەگی قەڵای خۆشاب خەلیفە برایم دەناسێ. هەستن بڕۆن. با بەگی قەڵای خۆشاب کارەکەتان لەبۆ بسازێنێ. مریدی خۆمە».

داوونەریتێکی کۆن هەبوو. ئەگەر لاوێک کچێکی هەڵگرتبا و پەنای وەبەر ماڵێکی بردبا، جا باوی کچە هەر کەسێک با، خانەخوێ کچەکەی نەدەداوە. بەهەر نرخێکی با، باوی کچەی قایل دەکرد، شیربایی و مارەییەکەی دەدا، شایی و زەماوەندی بۆ دەگێڕا. جا لە سۆنگەی کیژ ڕەدووکەوتن و کچ هەڵگرتنەوە خوێنێکی زۆر دەڕژا.

گوڵبەهار و ئەحمەد بۆ کن بەگی قەڵای خۆشاب دەچوون. بەگی قەڵای خۆشاب بەگێکی نیوە دەستدا و نیوە پێوەندی عوسمانلییان بوو. ئەو کچە هەڵگیراوەش نەک کچی مەحموودخان، کچی خونکاری عوسمانلیش با، بەگی خۆشاب نەیدەداوە. ئەو ڕەفتارە لەگەڵ نەریتی بەگایەتیدا نەدەگونجا. شەڕی دەکرد، سەری دەدۆڕاند، بەگایەتییەکەی لە دەست دەچوو، بەڵام کوڕ و کچەی وەدەستی کەس نەدەداوە. قەڵای خۆشاب قەڵایەکی جوان بوو. لە خاوەری گۆلی وانێ، لەسەر شاخێکی تووشی وەکو دیوار، بەسەر کاروانەڕێیەکی گەورەوە کە لە دەشت و ئارانەوە هەوراز هەڵدەکشا، لەسەر شاخە بەردێکی تووشی وەکو دیوار ڕۆنرابوو و بە سێ وارشی سەخت و قایمییەک لە نێو یەک شووره درابوو. ئاوی ڕوون و سازگاری خۆشابی بە بندا تێ دەپەڕی. کەس نەیدەزانی کەنگێ هیمی ئەو قەڵایە لێ درابوو لە سەدان ساڵ بەم لاوە، هەر چەرخە و پارچەیەکی لێ زێدە کرابوو. بەڵام قەوارە کۆنەکەی خۆی نەدۆڕاندبوو. بەگی خۆشاب لە جوانترین قەڵای سەر دنیایێ دادەنیشت.

گوڵبەهار و ئەحمەد لە بن زناری قەڵایێ پیادە بوون.

ئەسپەکانیان کێشانە خوارێ، بۆ سەر ئەو ئاخورانەی کە لە خوارێ، لە پێدەشتێکدا بۆ ئەسپی سەربازی بەگ دروست کرابوون. کێشکچی ئەگەر چاویان بە خەلیفە برایمی کەوت، یەکسەر وەنیاز کەوتن و بەرەو قەڵایان برد.

بەگ پاش ئەوەی ڕووداوەکەی ورد و درشت لە زاری برایم بیست، گوتی:

«ئەم مەحموودخانە نەریت و دەستووران نازانێ. ئەو بەگ نییە، پاشایە، عوسمانلییە. ئەگەر بە هاتنی ئەم منداڵانەی زانیبێ، بێ سێ و دوو قۆشەنمان دەکاتە سەر. چ بکەین، ڕاستتان دەوێ، دەبێ کچە بپارێزین. سەرپاکی ماڵ و سامانمان دەدەین، کچە لە ئەحمەد مارە دەکەین، فەرمانی پیرمان لەسەر سەرمان، گیانیشمان دەدەین».

شەقەی لە دەسی هێنا پێشخزمەتان هاتن، فەرمانی دا:

«نان بۆ ئەو میوانانە دانێن، جێگا و ڕێگایان نیشان دەن، لە دوورەوە ئەسپیان ئاژواوە».

ئەگەر گوڵبەهار و ئەحمەد وەدەرکەوتن خەم و کەسەر ڕوخساری بەگی خۆشابی داگرت. هەور و هەڵای خەفەت بەر چاوی گرت. قژە کاڵەکەی هەڵماوی بوو. ڕاچەنی، هەڵستا سەر پێیان، زۆر کەڵەگەت بوو، گوتی:

«خەلیفە، فەرمانی پیر بەسەر سەران، بەڵام چۆن لە ژێر ئەو بارە دەرچین؟ کچی هەر پیاوێکی دیکە با، هەر ئێستا سوار دەبووم، دەچووم، دەمگوت بیکە بە خاتری من، گوڵبەهاری کچت بدە بە ئەحمەد. بەڵام مەحموودخان بەم زمانە حاڵی نابێ، هەر یەکسەر خەڵک زیندان دەکا. پیاوێکی بە شەرەف و ئازایە. ئەمن لە ئەستەمبووڵەوە دەیناسم. باویشم باوی دەناسێ. بەڕاستی سەیرە، ئەحمەد ئەم کچەی چۆن لەسەرا رفاندووە، دە بۆم بگێڕەوە، بەڵکو بەو جۆرە چارەسەرێکی لە بۆ بدۆزینەوە».

برایم لە پێشدا لە ئەسپەکەوە دەستی پێ کرد، چۆنی ڕوودابوو بەو ڕەنگەی گێڕایەوە. ئەوجا بەسەرهاتەکەی یەک یەک بۆ گێڕاوە.

بەگ گوتی:

«کارێکی سەختە، خەلیفەم، سەختە، زۆر دژوارە. مەحموودخان هار بووە. تۆڵەی ئەمە لە چیای ئاگری، لە دەریاچەی وان، پاشان لە منی دەکاتەوە. لە مێژە خەبەر وە پاشای وانێ گەییوە، بەڵام چ بکەین».

ئەوێ شەوێ هەر بیری کردەوە، بۆ سبیانێ برایمی بانگ کرد، گوتی:

«بنۆڕە، خەلیفەم، بڵێ چم بیرکردەوە. پاش پازدە بیست ڕۆژی دیکە مەلا محەمەدی زمان پاراو دەنێرمە کن مەحموودخان، بۆ ئاشتبوونەوە و مەسڵەحەت هەرچییەکی ویست دەیکەم. بە پیرم بڵێ ئەگەر مەحموودخان لە تۆڵەی کچەکەی قەڵای خۆشابیشی ویست دەیدەمێ. ئەگەر لەشکری عوسمانلیشم بکاتە سەر، تا سەرم نەدەم ئەو کچەی نادەم. سەلام لە پیرم دەکەم و بەرانبەر بەو پشت پێ بەستن و بڕوایەی، بەرانبەر بەوەی کە ئەو ئەمانەتە بە نرخەی پێ ئەسپاردووم زۆر منەتبارم. دەستی ممبارەکی ماچ دەکەم».

ئەوێ شەوێ کێهە ژوور لە هەموو ژوورەکانی قەڵا میچ بڵندتر بوو، بە مەڕ مەڕ بوو، نایابترین لبادی سووری لێ ڕاخرابوو، دیوارەکانی بە بەڕە و مافووری نایابی کوردەواری داپۆشرابوو، ئەوەیان بە میوانە ئازیزەکان پێشکەش کرد. لێفەکەیان ئەتڵەس بوو. دۆشەگەکەیان پان و بەرین بوو.

گوڵبەهار هاتنە ژێر جێوەی ئەحمەدی زۆر بە ڕێزەوە چاوەنۆڕ کرد. چرایەکی زیو بە دیوارەوە هەڵکرابوو. ڕۆنی نێو چراکە بۆنێکی خۆشی تێکەڵ کرابوو و ژوورەکە پڕ بووبوو لە بۆنی خۆش پیاوی مەست دەکرد.

ئەحمەد پێش ئەوەی بچێتە ژێر جێگاوە شیرەکەی هەڵکێشا، بە ڕووتی لە ناوەندی دۆشەکەکەی دانا. مشتووە زێڕەکەی لە بن سەرینەکەیاندا مات بوو. ئەحمەد لەم دیوی سەرینەکەوە درێژ بوو. گوڵبەهار سەری لەو کارە سوڕما.

ئەحمەد لە ڕێگاش لە خانەکەی ئەرجیشیش، لە وانێیش هەر وای کردبوو. ئەحمەد بەو کارە دەیویست ئەوە لە گوڵبەهار ڕاگەیێنێ کە گۆیا هەر خوشک و

باران. بەڵام ئایا خوشک و برایەتییان لە نێواندا مابوو؟ ئەدی گوڵبەهار لە ژووری زیندانێ، کە پێی وا بوو جارێکی دیکە چاوی بە ئەحمەد ناکەوێتەوە، قەتی خۆ بە ئەحمەد نەدابوو؟ نەبووبوو بە ژنی؟ ئەدی ئەم شیر لە نێوان دانانەی لە چی و ئەحمەد لەمە چی مەبەست بوو؟

گوڵبەهار هەناوی بە جارێ گڕی گرتبوو. چ بوو؟ چ قەومابوو؟ نابەدڵییەکی ئەحمەدی لە دەست قەومابوو؟ یاخۆ ئەمە یەک لە نەریت و دەستووری ئاگرییاییان بوو و ئەو نەیدەزانی؟

تا سبیانێ خەو نەچووە چاوی. چەندین چەند سۆنگە و هۆی چاک و خراپی بە بیرداهات. گوڵبەهار وەکو ژێ کرژ بووبووەوە و لە ئەشقان هەر ئەوەبوو شێت نەبێ. بەڕاستی ئەوەی کە نەدەشێردراوە ئەوەبوو کە گۆڕانێک سەری هەڵدابوو و ئەحمەد وەکو باران، وەکو لە ژووانان یەکدییان دەدیت نەیدەعاملاند. زۆر سارد بوو، زۆر تووڕە بوو، زۆر بە ئەندێشە و پەژارە بوو.

ئەم گۆڕانەی ئەحمەد چ بوو و سەبارەت بە چ بوو؟ گوڵبەهار خۆی پێ نەگیرا، ئەحمەدی بە توندی وەخەبەر هێنا، گوتی: «هەڵستە، دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم. بەڵام ڕاست و ڕەوان، بە دڵ وەڵامم بدەوە».

ئەحمەد قسەی نەکرد. لووتکەی چیاکانی خاوەر سپی دەچوونەوە، تیشکێکی خەست و پەیت، پارچە پارچە بەسەر نوێنەکانیاندا هەڵدەڕژا.

«ئەم شیرەت بۆچی لە نێوانماندا دانا؟ دەمەوێ لە سۆنگەی بگەم. ئەدی لە سەرایێ نەبووم بە ژنت؟ ئیتر پاش ئەوە شیر لە نێوان دانان بووە و بیستراوە؟ یانەکو ئەمە داوونەریتی چیاییانە و ئەمن نایزانم؟ وەڵامم بدەوە خۆشت دەوێم».

ئەحمەد کڕ بوو.

گوڵبەهار دووپاتی کردەوە:

«دەبێ وەڵامم دەیەوە».

ئەحمەد وەڵامی نەداوە، گوڵبەهاریش پەیتا پەیتا داوای وەڵامدانەوەی لێ



گوڵبەهار و ئەحمەد شیرێکیان لە نێواندایە و نووستوون

دەکرد. ئەحمەد لە شەرمان هەر ئەوەبوو بە ناخی ئەرزدا نەچێ، دەیویست ئەوی بە بیریدا دەهات لە مێشکی بتارێنێ، بەڵام هەرچەندی دەکرد و دەکۆشا دەرۆستی بیری وا بە سام نەدەهات. بیری وا جەرگبڕی، نەک بە گوڵبەهار، تەنانەت لە شەرمان بە خۆشی نەدەتوانی بڵێ. ئاخرییەکەی ناچاربوو دەست بە درۆیان بکا، گوتی:

«شتی وا لە داوونەریتی ئێمەدا نییە، بەڵام خەڵکی ئەم قەلایە، خەڵکی کەناری گۆلی وانێ، خەڵکی ئەو دەشت و ئارانانە نەریتیان وایە، منیش بۆیەم وا کرد. تا باوت قایل نەبێ دەستت بۆ نابەم».

گوڵبەهار دڵی بەو قسانە ئاوی نەخواردەوە. دەیزانی ئەوانە هەموو بیانوو و پینە و پەڕۆیە.

چەندین ڕۆژ ڕابرد. پەژارە وەکو گورگی هار دڵ و دەروونی دەکرۆشت. گوڵبەهاریش هەستی بەوە کردبوو. ئەحمەد چاوی بە قووڵداچووبوو، بریقە و ڕووناکی بێ تێیدا نەمابوو.

گوڵبەهار ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە ژێر ئەو بارە گرانەدا دەپووکایەوە. دنیای ڕوونی لێ بووبوو بە چوار دیواری ڕەش و تاریک. پێی وا بوو تووشی سووکایەتییەکی زۆر گەورە هاتووە. لەو حەرەمسەرا گەورە و گرانەدا، خەمناک، خەوڕۆ، بێ ئەوەی پارووە نانێکی لە زار نێ، وەکو شێت هەر دەهات و دەچوو. ئەحمەدیش لەگەڵ بەگی خۆشابدا حەوتووی جارێک سوار دەبوون دەچوونە ڕاو و شکار، ئێواران بە کەلاکی بزنە کێوی و مامز و باڵندەی زەلام و سەیرەوە دەگەڕانەوە. گوڵبەهار مەگەر لەو ڕۆژانەدا کە ئەحمەد وەدەرکەوت پشووێکی دابا. هیچ نەبا ئەحمەدی بەو حاڵەوە نەدەبینی. کار گەیشتبووە رادەیەک ئیدی ئەحمەد تەماشای گوڵبەهاری نەدەکرد. ئەوانی لە قەلادا بوون هەموو هەستیان بە حاڵی ئەحمەد کردبوو.

بەگ سا نا ساتێ ملی ئەحمەدی دەگرت، دەیگوت:

«خەمت نەبێ کوڕم، ئەحمەد، ئەگەر سوپای عوسمانلییان هەموو کردوومە

سەر، دەبێ ئێوە بە کامی دڵی خۆتان بگەن و بە مرادی خۆتان شادبن. ئەوی ڕووو لە ماڵی من بکا، هیمەت و بەرەکەتی پیری کاروان پشتیوان بێ و لە ژێر چاودێریی ئەودا بێ، دەبێ لە چ بترسێ، لە چ بسڵەمێتەوە؟ ئایا ڕەوایە بە ناهومێدییەوە بگلێ؟»

ئەحمەد خۆی لە قسەکانی بەگ دەبوارد و هەر پێ دەکەنی. کەس پەی بە دەردی دڵی نەدەبرد، تەنانەت گوڵبەهاریش، کە دووره سۆسەیەکی دەکرد، هەڵی نەدەهێنا.

مەلا محەمەد پازدە ڕۆژ بوو چووبوو بۆ بایزید، ئەو سبەینێیە گەڕایەوە. بەگ و ئەحمەد خۆیان بۆ چوونە ڕاوێ ئامادە دەکرد.

بەگ مەلا محەمەدی بانگی دیوەخانێ کرد:

«چ بوو محەمەد؟ چابوو، خرابوو؟»

مەلا محەمەد گوتی:

«خراپە».

ڕدێنە سپییەکەی دەتکوت ئاوی ڕوونە بە ڕوخساریدا دەهاتە خوار. گوتی: «پاشا زۆر خراپی پێشوازی کردم، زۆر خراپ. هێندەی نەمابوو شیرم لێ هەڵکێشێ و لەت و پەتم بکا. گوتی: ئەو دژمنایەتی و ئاڵچاخییەم لە هەموو کەسێکی چاوەڕوان بوو تەنێ لەو نەبێ. پێی گوتم، بڕۆوە پێی بڵێ: کچە و کوڕەم هەردووک بۆ پێکەوە ببەستێ و زوو بیانێرێتەوە. دەبێ بلووکێ سەربازیشیان لەگەڵ بن، هەر پاش گەڕانەوەت بە پازدە ڕۆژ ئەوەم لە بەگ چاوەنۆڕە. گوتی: ئەگەر ئەحمەد و کچەکەم بۆ نەنێرێتەوە لەشکری لێ دەکەم». هەرچییەکیشی بە زاردا هات نە لە تۆ نە لە پیر نەپرینگاوە.

«بە پیریش؟ بە پیریش؟»

«بە پیریش».

«ئەم کابرایە شێت بووە، ئەقڵی تێک چووە»

بەگ قەدەرێ دۆش داما، ئەنجا چووە دەرێ. ئەحمەد لەبەر دەرکەی

چاوەڕوانی بوو. پاشان بێ ئەوەی هیچ بە ئەحمەد بڵێ، پێکەوە لە قەڵا چوونە خوارێ، بۆ سەر پردەکە. ئەحمەد چاوی پڕ بووبوو لە پرسیار. چاوەڕێ بوو قسە بکا. دوایی لەسەر پردەکە وەستان. بەگ گوتی:

«ئەو کابرایە شێت بووە، تەنانەت جنێوی بە پیریش داوە. دەوجا بزانە چ بەڵایەکی وەسەر بێنێ. گۆیا پاش پازدە ڕۆژانیش لەشکرمان دەنێرێتە سەر».

ئەحمەد گوتی:

«با ئێمە لێرە نەمێنین، بەگم خوا هەڵی ناگرێ، بۆچی لە نێوچاوانی ئێمەوە خوێن برژێ».

بەگ هەڵزەقییەوە، گوتی:

«بۆ هیچ کوێ ناچن، لەوەتی قەڵای خۆشاب ڕۆنراوە، تا ئێستا کەس دەرکەی نەکردووەتەوە. مەحموودخان ئەگەر بە تەمای هاتنێیە دەبێ بە تەمای بینینیش بێ. تۆ کوڕی ئەم ماڵەی بۆ چ جێیان ناچی. ئەوە شەرەف و نامووسی منە. هەر من لە گۆڕێدام و بەس. تۆ نی. ئەتوو بۆ خۆت لە قەڵا دانیشە، گوێ مەدە هیچ».

بەگ پاش ئەوەش لەگەڵ ئەحمەددا لە راو و شکاری خۆی نەکەوت. دەچوونە ڕاو، چاوەڕوانی لەشکری مەحموودخانیان دەکرد، خۆیان لەبۆ شەڕ ئامادە و تەیار دەکرد.

لە دەشتەکانی باشوورەوە، لە ئاگرییەوە، لە ئارانی مووشەوە، لە گۆلی ورمێوە، لە وانەوە، لە بتلیسەوە، لە دیاربەکرەوە کۆمەک و یارمەتی بە بەگی قەڵای خۆشاب ڕادەگەیاندرا، لە هەموو لایەکەوە دەستی دۆستایەتی درێژ دەکرا. بەگیش زۆر بەم هەڵوێستە شاد و خۆشحاڵ بوو.

خۆ لە پێناوی پاراستنی نەریتی بەگ نشینێکی کەونارای وەکو قەڵای خۆشابدا، لە پێناوی قەرزێکی لە ستۆیدا بوو، لەو ڕاستانی پێش قەڵای خۆشاب جارێکی دیکەش شانێکی لە شانی عوسمانلی دەدا.

لەگەڵ کزنگی ڕۆژدا بوو کە دەستە سوارێک بە دیارکەوتن. ڕێ و ڕاست



ئەحمەد لەگەڵ بەگی خۆشابدا دەچێتە ڕاو

دەهاتن، ئەسپەکانیان هەموو کوێت بوون. سوارەکان لەسەر پردەکەی خۆشابەوە جڵەوی ئەسپەکانیان وەکێش کرد. پێشکاران سوارەکانیان بە ڕێزەوە پێشوازی کرد و جڵەوی ئەسپەکانیان لە دەست وەرگرتن.

بەگی خۆشابێ لە دەرکەی وارشی ژووریێ بە پیری زەلامەکانەوە چوو. هەموویانی لە نێزیکەوە دەناسی. بەگی هۆز و خێڵەکانی ئەو دەوروبەرانە بوون. دەشیزانی سەبارەت بە چی هاتبوون. کەواتا مەحموودخان دەستی لە شەڕ هەڵایساندن هەڵگرتبوو.

بەگی زیلان کەڵە لاوێکی شۆخ و ئازا و بوێر و خوێن گەرمی بەجۆش بوو. ئەو قسەی کرد. لووتێکی قوڵینگانەی پێوە بوو. دەنگی نێر و دلێر بوو، گوتی:

«بەگ، با لە سەرێنی ئەمەوە شەڕێ نەقەومێ. بۆیە هاتووین، چارەسەرێک بۆ ئەو کارە بدۆزینەوە. مەحموودخان لەشکری دەکێشا، بەڵام ئێمە پێشمان لێ گرت. جا ئێستاش قسە قسەی تۆیە».

بەگی خۆشاب هاتە دوو، گوتی:

«ئێوە بۆ خۆتان هەموو شتێکی لە من چاتر دەزانن. من ئەحمەد و گوڵبەهار نادەمەوە. لەوەش زیاتر هیچ چارێکی دیکەم نییە. لەوە بترازێ پاشا هەر شتێکی دیکەی لێم دەوێ بەسەر سەرم. من ئەو کوڕ و کچەی وێ دەمەوە تا دنیا خرا دەبێ نەخۆم نەهۆزەکەم چاومان لەبەر سەگانیش هەڵنایە. ئێوە بەو هەموو بەگە بۆ خۆتان چارەیەکی بۆ ببیننەوە. ملم لە موو باریکترە. حورمەت و ڕێزیشم عەرزی پاشا بفەرموون. حەزێ دەکا سەر و ماڵم هەمووی لە قەبەڵ دەکەم. چی دەوێ بۆی بە ڕادانێ دەدەم، چەند گوند دەڵێ پێشکێشی زاوای دەکەم. خۆشی کەیفی چی دێنێ بەسەر هەرتک چاوان. بەڵام میوانی ماڵی خۆمی بۆ کیانێ بە دەستەوە نادەم».

بەگی زیلان گوتی:

«بەگ ڕاست دەکا، ئێمە لە خۆڕایی هاتووین».

ئەوانی دیکەش گوتیان:

«له خۆڕایی هاتووین، کارێکی دزێومان کرد. ئەگەر تۆزکاڵێکمان پیاوەتی لەزاتدا هەبا ئەو ڕاسپاردە دزێوەمان لە مەحموودخان قبووڵ نەدەکرد و لە ڕاستی بەگ تووشی ئەو ڕووزەردی و شەرمەزارییە نەدەهاتین. بەڕاستی شوورەییمان کرد».

بۆ ڕۆژی پاشێ سواربوون، تێیان تەقاند ڕۆشتن.

مەحموودخان چاوەڕوان بوو بەگەکان ئەحمەد و گوڵبەهاریان ڕەگەڵ خۆ خستبن، گوێی هەردوکانیان لە مست نێن. هەروا بیری دەکردەوە: بە چ جۆرە ئەشکەنجە و ئازارێک داخی دڵی خۆیان پێ بڕێژێ و چۆنیان بتاسێنێ و لە نێویان ببا. قەتی جارێکی ئەوە بە بیردا نەدەهات کە ڕەنگە بەگی خۆشاب نەیانداتەوە و بەگەکان بە دەستی خاڵی بگەڕێنەوە. چونکە گەف و گوڕەشەیەکی توندی بۆ بەگی خۆشاب ناردبوو. گوتبووی لەشکری عوسمانلیی دەکەمە سەر. بەگی خۆشابیش وەکو جاران هێند بە هێز و کار کۆک نەبوو، بە هەر نرخێکی با دەبوو کچە و کوڕەی بداباوە. دەنا ئەو هەموو بەگە گەورە گەورانە چۆن دەڕۆیشتن.

ئەگەر بەگەکان بە دەستی خاڵی گەڕانەوە مەحموودخان بە جارێ شێت و هار بوو. قەتی وا بەو ڕەنگە چاوەڕوان نەبوو. خراپ قەومابوو. کەس گوێی نەدەدا عوسمانلی و موسمانلی، تەنانەت هێز و گوڕی بە بەگێکی وەکو بەگی قەڵای خۆشابیش ڕانەدەگەیشت و دەسەڵاتی پێ ڕانەدەشکا و دەبوو حاڵ و حسێبەکەی ورد و درشت وەکو خۆی چۆنە، ئەوها لە ڕۆستەم پاشای ئەرزەڕۆمێ ڕاگەیاندبا و کۆمەک کردنی لەگەڵ بە تەواوەتی ساغ کردباوە، لە پاشان قەڵای خۆشابی خاپوور و نوغرۆ کردبا. تووڕەیی خۆی هیچ لەکن بەگەکان بەدیار نەخست.

بەگی زیلان گوتی:

«بەگی قەڵای خۆشاب هەقیەتی، لەبەر خاتری کیانێ، دوو دڵدار چۆن بەدەستەوە دەدرێن؟ با پاشا چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە».

پاشا ئەوێ ڕۆژێ زیافەت و میوانداریيەکی زۆر گەورە و گرانی بۆ بەگەکان ساز دا. دیومخان زۆر ئاپۆرە و قەڵەباڵغ بوو. سبەینێ پاشا ڕووداوەکەی لە نووکەوە بۆ پاشای ئەرزەڕۆم نووسی. پاشای ئەرزەڕۆم یەک بوو لەوانی کە زۆر چووبووە دڵی پادشاوە. چەندین چەند لە سەرای ئەستەمبووڵێ مابووەوە و لەگەڵ گەورە وەزیران زۆر هەڵستابوو و دانیشتبوو. ئەگەر پاشای ئەرزەڕۆمێ پشتی گرتبا هەموو شتێ سانابوو و کەللەی سەری ئەو بەگە لە خۆبایی بووەی خۆشابیشی بە هاسانی وەچەنگ دەکەوت. کاغەزەکەی زۆر بە گازاندە بوو. شەوێ لە شەوان چۆن سەد هەزار سواری دڕندە، وەکو گورگ لە چیا هاتبوونە خوار و بەسەر سەریاندا دابوو و کچەکەیان فڕاندبوو، و ئەمیش بە خۆی و سەربازەکانییەوە لە بەرانبەر ئەو هەموو عەشاماتە گەورە و گرانە دەستە پارچە دەوەستن و چییان لەگەڵ ئەو لێشاوە زۆر و زەوەندەیە پێ ناکرێ و چی و چی دیکەی لە وردەگازاندەوە بۆ پاشای ئەرزەڕۆمێ نووسیبوو.

ئەو پەیکەی ماوەیەکی زۆر بوو بۆ ئەرزەڕۆمێی ناردبوو گەڕاوە.

ڕۆستەم پاشا نامەکەی خوێندبووەوە زۆر پێ کەنیبوو. ئەگەر پەیکەکەی مەحموودخان باسی قەڵەباڵغییەکەی ئەوێ شەوێی بۆ دەگێڕێتەوە ڕۆستەم پاشا هەردوو دەستی بەبەر ورگییەوە دەگرێ و دەداتە قاقای پێکەنینێ و هێندەی نامێنێ بپچڕێ، دەڵێ:

«زۆر سەلام لە مەحموودخان دەکەم، پێی بڵێ کیژەکە لە کوڕە مارە ببڕێ. ئەو کچەش وەکو ئەسپەکەیە، تازە بووە بە ئی کوڕە. ئەمنیش بۆی دەنووسم».

مەحموودخان ئەگەر نامەکەی ڕۆستەم پاشای، کە بە خەتێکی خۆش نووسرابوو، خوێندەوە، گوتی: «هەی ئاڵچاخی کوڕی ئاڵچاخ، گاڵتەم پێ دەکا. دەبا ئەوە بەسەر خۆی هاتبایە: بەگێکی چیایی کیژی ویی فڕاندبا. جا هەنگێ بمزانیبا گاڵتەی بە چ دەهات؟ یانەکو زمانی هەڵدەهاتەوە بە تەوسەوە بڵێ: لە سۆنگەی کچێک بە تەمای ئاگری شەڕ لەو هەموو دنیایە هەڵایسێنی؟ دەوجا وەرە، منیش سەگی وام بە دۆست زانی و لەماڵی خۆمم وەکو پادشایان ڕێز لێ گرت. هەبێ و نەبێ بەخیلی و ئێرەیی بە کۆشک و سەراکەمدا هاتووەتەوە

و بەم نامەیە تۆڵەی خۆیم لێ دەکاتەوە».

ئیدی کاغەزەکەی هەروا بەم دیو و بەو دیودا هەڵدەگێڕاوە و جارێکی دەخوێندەوە و جارێکی بیردەکردەوە.

لەشکری دەکێشا سەر قەلای خۆشابێ. باشە هاتو لەبەر بەگی خۆشاب، دڕندەیەکی وا بەزی، لەوەتی قەڵای خۆشاب قەڵای خۆشاب بوو بەزینی بە خۆیەوە نەدیتبوو.

مەحموودخان تا دەهات هەناسەی پتر سوار دەبوو. ئەگەر هەناسەشی زۆر سوار دەبوو، ئیدی بەجارێ لەنگەری لەدەست دەترازا، هەموو ڕۆژێ لەگەڵ سمایل ئاغادا قسەی دەکرد. هەرچی بەگی جێ بڕوای هەبوون، هەمووی بانگ دەکردن، ڕاوێژی لەگەڵ دەکردن، بەڵام چارەیەکیان پێ نەدەکرا.

لەو دەمیدا باڵیۆزی بەگی خۆشاب، مەلا محەمەدی دەمودوو شیرن لە هاتوچۆدا بوو، دەیگوت: «پاشام، هەمووت بە قوربان بین، بەگی ئێمە دەڵێ، لە سەرێنی کچێکەوە بۆچیم بۆسۆ و بەدناو دەکا. دەستەکانی ڕادەمووسم، ئەگەر پاشام میوانەکانم لێ بستێنێتەوە، ئەوسا لەبەر سەگانیش چاوم هەڵنایە. چەندی شیریایی دەوێ دەیدەم. ئەگەر مەحموودخان ڕۆحیشمی بوێ دەیدەم. بۆ ئەحمەدیش، بڵێ بمرە، دەمرێ».

بەگی خۆشاب هەڵوێستی مەحموودخانی ڕۆژ بە ڕۆژ لە دوور و نێزیکەوە سۆسە دەکرد. ئاگای لەوە هەبوو کە پێیەکی لە کن پاشای ئەرزەڕۆمی و پێیەکی لە کن پاشای وانێ بوو و مەسەلەکەی لە ورد و درشتی بەگەکان، لە ئەستەمبووڵ، لە پادشا ڕاگەیاندبوو و بە هەمووولایەکدا هەڵپەی دەکرد. ئەم کابرا بێ ئەقڵە کەللەڕەقە ئەمڕۆ بێ یا سبەینێ بێ قۆشەنی دەکێشێتە سەر و شەڕێک هەڵدەگیرسێنێ، سالانی ساڵ درێژە بکێشێ، هەژار و دەستەوسانان دیسان لە برسان پەرێشان دەبن و لە نێوچاوانی کچێکەوە داخۆ چی بەسەر ئەو عالەمە بێ. توخوا ئەمە نەریتە؟ داخۆ کێ، چ بەگێکی گەلۆر، چ خەڵکێکی بێ ئەقڵ دای هێنابێ؟

پاشـاش دەترسـا. دەبوو کارەکـەی دوایی پێ هـێنابا. هاتنی ئەسـپەکـە بۆ پێش مـاڵی ئەحـمـەد، سـەرەنجام دڵدارییەکی وا گـەورەی لێ بکەوێتەوە، مـەمـۆ هـەر بۆ ئەوەی ڕێزی خـۆی بۆ گـوڵبـەهار ئیسـپـات کا، خـۆی بە قـوربانی ئەم دڵدارییە بکا، ئەمانە هـەموو شەخسییەتێکی پیرۆزانەی بە ئەحمەد و گوڵبەهار دەبەخشی. دیسـان شەوێک خـەڵکی ئەو چیای سـەرێ، خەڵکی ئـەو دەشتـانەی خـوارێ هـەڵدەسـتن، ئەم جـارە دار بەسـەر بـەردەوە نایەڵن، سـەرا دەڕووخـێنن و زیندەوەرێکی تێدا بە ساغی نایەڵن.

مـەحـمـوودخـان ئیدی بە جـارێ تـەڕایی لە گـەروودا نەمـابوو. شـەوانە خـەوی لێ نەدەکەوت. گوێی هـەڵخـسـتبـوو، لە چکۆلەترین سـرتە ڕادەچەنی، بە شـیـری ڕووتەوە لە نێو سـەرادا دەهـات و دەچوو. بە جارێ هـەر چوار سـەری دنیای لێ هـاتبـووەوە یەک. هـەرچەندی دەکرد چارەسـەرێکی بۆ ئەو کـارەی نەدەبینییـەوە، شەرەف و ئابڕووی کیشـوەری ئال عوسمـان لە سایەی ویـیەوە بووبوو بە چوار پووڵ.

بەرانبـەر بەگـی خـۆشـاب بەزیبـوو. عـوسـمـانلیش بـەزیبـوو. تـا دەهـات دەتوایـەوە، دەبڕایەوە. بۆ خـۆشـی نەیدەزانـی چیـی دەکـرد. ئیـدی کـەسـی نەدەدواند. تـا دەهـات چەمـبـەر و ئاڵقـەی تووک و نەفـرینی تـوندتر لە گـەردەن دەئالا. ئەو هـەستەی لێ بووبوو بە گرێیەک و لەسەر دڵی ڕەق بووبوو.

هـەموو سـاڵێ کە بـەهار دەگـەڕێتـەوە چیـای ئاگری، شـوانی ئەو دەوروبـەرانە هـەموو دێنە سـەر کەناری گۆلی کووپە، کەپەنـەکەکانیان بە ئاڵقە لەسـەر خاکی مس ڕەنگی گـۆلەکـە، لەسـەر بەردەچـاڕی بەردەسـتـێ سـوورەکـان ڕادەخـەن و دادەنیـشن. ژمارەی شـوانەکـان سـاڵ بە سـاڵ دەگـۆڕێ. هـەرکە ئاسـۆ ڕوون دەبێـتـەوە بلوێرەکـانیـان لەبەر پشـتـێنیان ڕادەکـەنەوە و ڕاست دەبنەوە. لەو دەمـیـشـدا باڵندەیەکی چکۆڵەی سـپی دێ، باڵێکی لە ئاوی شـینی گـۆلەکـە وەردەدا و دەفـڕێ، دەڕوا. لـە دوور، لە سـەرووی سـەرێ، لە ڕەوەزێکەوە، کـە وەکو کەشتـی، لە وڵاتی بەفرستـانێ دەکشێ، ئەسـپێکی زەلام بە دیار دەکەوێ. قـایش و بەندی لە تاریک و ڕووندا دەبریقێتـەوە. دەبێ بە تارمـاییـیـەک بەسـەر

گۆلەکەدا دەخزێ، پارچە پارچە دەڕەوێتەوە و ڕەنگی دەپەڕێ و لەو دەشتە دەتوێتەوە و دەکشێتەوە و نامێنێ.

ئەگەر شوانەکان دەکشێنەوە، دەڕۆن گۆرانیبێژێک لە نێو ڕەشماڵێکدا چۆک لەسەر خاکی تیژی بەهارێ دادەدا و دەست دەداتە گۆچانێ و گۆرانی دەچڕێ و بلوێر ئەنگێوێکیش بۆی دەستێنێتەوە.

لەسەر خاکی نەحلەتی ئاخۆری چۆکم دادا، لەسەر خاکی ئەوینی هەزار ساڵە، لەسەر خاکی بەهاری هەزار ساڵە چۆکم دادا. سێ جارانم بانگ کرد. هەرسێ جاران چیای گەردنکەش وەڵامی دامەوە.

لەسەر گولیلکی سوور سوور، ئی شین شین، ئی زەرد زەرد، ئی کەسک کەسک، لەژێر خەرمانە ئەستێرەکەی سەر ترۆپکی چیای چۆکم دادا. لەسەر پشتی چیای، لەسەر سەهۆلبەندانی دڵی چۆکم دادا، لەبەر ڕووناکی ئەو چیایەی کە دەروونی بۆ ئەوینە گەورەکان کردووەتەوە چۆکم دادا. گۆرانیی تووڕەییەکم چڕی کە کەس نایگاتێ. لە ژێر هەوری ڕەش و تاریک، لە نێو بۆن و بەرامەیەکی کە پیاو مەست دەکا، چۆکم دادا. لەسەر لافاوێکی کڵپە و کرێکی گەورەی بێ سەر و شوێن، کە لە چیای دادەکشێتە خوار چۆکم دادا. سێ جارانم بانگی چیای کرد، سێ جارانم هاوار کردە دڵی خاکی بەهاری هەزار ساڵە، سێ جارانم وەبەر گوێی خاکی ئەوینی هەزار ساڵە دادا. گوتم شوانەوێڵە، هۆشوانەوێڵە، ئەوە لە کوێی؟ شوانە هات لەپێش دەمم قوت بووەوە.

شوانەوێڵە ئاشقی کچی بەگ بوو. کچەش ئاشقی ئەو بوو. بەگ پێی زانی. بەگ پازدە گوندی بوون. هەر پازدە گوندەکەشی لە دۆڵی ئاخورپێ بوون. بەگ گوتی: ئەو شوانە بگرن. ئەو شوانەی کە وێراویە دڵداری لەگەڵ کچی من ڕۆنێ. مردوو، یا زیندوو هەر دەمەوێ.

باڵندەی ئەوین بوو بە ئاگر. هێلانەیەکی لە ئاگر ڕۆنا، لەسەر کرە دارچنارێک. باڵندەی ئەوین لەو هێلانەیەدا نوست. سێ بێچووی بوون.

باڵندەی ئەوین لەگەڵ سێ گڕە بێچووەدا هەڵفڕین. بە هەر لایەکیدا هەڵفڕین، لەهەر شوێنێکی نیشتنەوە گڕی گرت. چیا بوو بە گڕ. بەرد بوو بە گڕ، خاک و خۆڵ بوو بە گڕ، بەری ئاسمان، ئەستێران، هەموو لە نێو گڕ و کڵپەدا شڵەقان. ئینسانەکان هەموو گڕیان گرت. باڵندەی ئەوینی لە گڕ ڕسکاو پەڕییەوە ئەوبەری چیا، ئەوبەری دەریا، ئەوبەری چیا بوو بە گڕ، ئەوبەری دەریا سەرتاپا بوو بە گڕ، گڕ لە گولیلک پشکوتوون. ئێکجار ئەوانی هەرە شین شینەکان، زەردەکان، کەسکەکان هەموو گڕ پشکوتوون.

شوانەوێڵە پەنای وەبەر چیای ئاگری برد. دڵی چیای ئاگری بوو بە گڕ. پیاوی پازدە گوندان وەدووی شوانە کەوتن، بیگرن، بیکوژن. چیای ئاگرییان کون بە کون پشکنی. چیا شوانی وەشێرد، شوانەش بوو بە گڕ.

کچە خۆی لەبەر ئەو ئەوینە سەختە پێ ڕانەگیرا، ئەویش دایە چیای، منداڵ و مەزن، پیر و جوان، ژن و پیاوی هەر پازدە گوند وەدووی کچەش کەوتن. ئاگری کچەشی وەشێرد. کچەش بوو بەگڕ.

ڕۆژێکی شوانەوێڵە سەبری لەبەر دەبڕێ، دەستوور لە ئاگری دەخوازێ، وەدەردەکەوێ، دەڵێ: «با جارێکی چاوم بە دڵدارەکەم بکەوێ، ئەگەر کوشتیشیانم با بمکوژن». بەرەو گوندەکە چوو. سێ شەو و سێ ڕۆژان لە دەوری گوندەکە خولاوە. مردن کارێکی سانا نییە. ئاخرێکەی چاوی قوچاند، دەیویست نەختێ درەنگتر بمرێ.

ڕێ و ڕاست بەرەو گوندی چوو. نواڕی لە جێی گوندەکە پەپوو دەخوێنێ، بای وێرانی هەڵی کردووە. چووە گوندی. نواڕی هیچ نەماوە. تەماشای ئەولاتری کرد گوندەکانی دیکەش شتاقیان نەمابوون. پاشان ڕوانی لەولاوە، لە کن ئەو بەردی ماڵی خۆیانی لێ بوو، دڵدارەکەی ڕاوەستاوە. دوو دڵدار بە یەک گەیشتن.

مەڵێ چیای ئاگری لە زۆر ستەمان تووڕە دەبێ، کەرتێکی خۆی بەسەر هەر پازدە گوندەکەدا دەدا. پازدە گوند بە خەڵکەکەوەی بە ژێرەوە دەبن.



شوانە دڵدارەکە پەنا دەباتە بەر چیای ئاگری و
بلوێر دەژەنێ

چیای ئاگری هەڵیان دەلووشێ، جا تووڕەییـیەکەی ئاگری ئا ئەمەیە.
باڵندەی ئەوین بگرێکە، وەبەر هەر دڵ و دەروونێکی بکەوێ دەسبەجێ دەیکا بە پارچەیەک گڕ. هێلانەی ئەوین گڕە.

ئەمە تووڕەیی ئاگرییە. ئەمە بەڵای ئاگرییە. شان لە شانی ئاگری نادرێ. ئەمە تووک و لەعنەتی ئاگرییە.

جا هەموو بەهارێک، لەو دەمی گوڵی کوویە بە گوڵیلکان دەخەمڵێ، سەرپاکی شوانەکانی چیای ئاگری دێنە سەر کەناری گۆلەکە، کەپەنەکەکانیان لەسەر خاکی بەهاری هەزار ساڵە ڕادەخەن و گڕە باڵندەی ئەوین، باڵی لە شینترین جێگای گۆلەکە هەڵدێنێ.

حوسۆی ئاسنگەر، نیوە ڕووت هاتبووە بەر دەرکی سەرا پڕ بە دنیا دەیزریکاند: «پاشا، پاشا، گوێ دێرە، گوێت لە بلوێر ئەنگێوەکەی بوهارێ بوو؟ تێ گەیشتی؟ ڕک و غەزەبی ئاگریت بەسەردا برژێ، وەی دەرد و بەڵای ئاگریت لێ وارێ. بەرۆکی ئاشق و ئەویندارارن بەردە، بەسە».

مەحموودخان بە پیاوەکانی گوت:

«برۆن ئەو ئاسنگەرەم بۆ بێنن، بزانم ئەوە چ دەڵێ، با تێ بگەم».

حوسۆ نیوە ڕووت بوو. لەشە بەهێزەکەی لە لەشی مرۆیەکی سەرووی مرۆیان دەچوو. مەحموودخان ئەگەر چاوی پێ کەوت سەرسام بوو.

ئاسنگەر پرسی:

«ئەو لاوژە چکۆلەیەت بیست کە بۆم ناردبووی؟»

خان گوتی:

«بیستم».

«چاکە، چ دەڵێی، ناترسی؟»

پاشا کڕ بوو.

حوسۆ هەرچی بە زاردا هات گوتییە خان و وەکو کەرتە چیایەک هەڵستایە



حوسۆ ئەوەی بە زاریدا هات بە پاشا دەڵێ

سەر پێیان ڕۆیشت. هەر کە لە دەرکەی دیوەخان وەدەرکەوت، گوتی:

«تۆ دەزانی پاشا، تۆ دەزانی».

پاش ئەوەی ئەو چووە دەرێ، سمایل ئاغا چووە ژوورێ، گوتی:

«پاشام دەمەوێ چەند پرسیارێکت لە خزمەتدا بکەم».

پاشا گوتی:

«بپرسە».

«پاشا تا ئێستا کەس توانیویە بچێتە سەر لووتکەی چیای ئاگری؟»

پاشا گوتی:

«نەخێر».

«چاکە ئەوەی لە تیرەی ئینسانە دەگاتە ئەوێ؟»

«ڕەنگە بگا، بەڵام ناگەڕێتەوە، ئاگری دەیگرێ، ئیدی بەری نادا».

زۆر کەس چووبوونە سەر ترۆپکی چیای ئاگری تاقییان کردبووەوە. بەڵام کەس نەگەڕابووەوە.

خەرمانە ئاگرێک لەسەر تەپڵە سەری چیای ئاگرییە. لە نێوەندی پۆپەکەوەی بیرێک تا ناوەڕاستی دنیا ڕۆچووەتە خوار. یەکەم ئاگر لە دنیادا لەم بیرە وەرگیراوە. یەکەم ئاگرێک کە ئادەمزاد چاوی پێ کەوتبێ ئاگری نێو دەروونی چیای ئاگرییە.

مرۆ ویستوویە لەم ئاگرەی وەچەنگ کەوێ، وەچەنگی نەکەوتووە. یەک لە ئاگردزان خافڵانی چیای ئاگری بە هەل دەزانێ. چنگێ ئاگر لە کۆلی ئاگر دەپچڕێ، بەرەوخوار بۆی هەڵدێ، قەدەرێ دوور دەکەوێتەوە. لەودەمی چیای ئاگری بە خۆدا دێتەوە، دەنۆڕێ ئاگردزەکە وا بەرەوخوار سەری خۆی هەڵگرتووە و هەڕا دەکا. ئیدی یەکسەر کابرای ئاگر بەدەست لەجێی خۆی ڕادەگرێ و هەر لەوێدا دەیکا بە بەرد.

قەدپاڵەکانی چیای ئاگری پڕن لەم جۆرە ئینسانە بە بەرد بووانە. ئاگری،

هەرچیی چوویێتە سەر تۆقە سەری، هەر کەسێ ئەویی دیتبێ، ئاگری لێ دزیبێ، قەتی لێ خۆش نەبووە.

سمایل ئاغا گوتی:

«کەواتا، پاشام دەمەوێ پێشنیارێکت لە خزمەتدا عەرز کەم».

«بڵێ سمایل».

«با هەر ئێستاکانێ خەبەر بنێرینە قەڵای خۆشابێ، گوڵبەهار و ئەحمەد بگەنە ئێرە. دەفەرمووی بۆ خۆم دەچم بۆ خۆشاب دەیانهێنمەوە. ئەگەر ئەحمەد توانی بچێتە سەر ترۆپکی چیای ئاگری و پێی سەلماندین چووە، ئەوە کچەی بە دەستی خۆمان دەدەینێ. شایی و داوەتەکەشی لەسەر خۆمان. مەگەر بەو ڕەنگە لە ئەحمەد قوتار بین. لە دەمگۆ و زمانی خەڵک ڕزگار بین. ئیدی کەس قسەی بۆ نامێنێ».

پاشا گوتی:

«نامێنێ، بیرێکی چاکە سمایل. دە، دوو سێ بەگیش ڕەگەڵ خۆت خە، بچۆ بۆ قەڵای خۆشاب. با ئەحمەدیش بگەڕێتەوە. گوڵبەهاریش بێتەوە. ئەگەر ئەو داخوازەی لێ پەسند نەکردم، بە بەگی خۆشاب بڵێ کچەکەم لە بۆ بنێرێتەوە».

سمایل ئاغا، پێنج پیاوی، دوویان بەگ بوون، هەر ئەوێ ڕۆژێ وەدووی خۆ دا و بەرەو خۆشاب بەڕێ کەوتن.

گەیشتنە قەڵای خۆشابێ. بەگی خۆشاب لە جارانی گەلێک پتر و گەرمتر پێشوازی کردن و دۆستانەی میوانداری کردن. شایی و زەماوەند و ئاهەنگی بۆ گێڕان. سمایل ئاغا ئەوێ شەوێ کارەکەی لە بەگ ڕاگەیاند.

بەگ گوتی:

«سمایل ئاغا، چۆن دەبێ، ئەمە مردنە، پاشا، ئەحمەد بۆ مردن دەنێرێ. چما تا ئێستا کەسی وابووە وەسەر ترۆپکی چیای ئاگری کەوتبێ و گەڕابێتەوە؟ کەسی وا بیندراوە؟ بیستراوە؟»

سمایل ئاغا گوتی:

«ئەمن نازانم، ئێوە بۆ خۆتان گوتبووتان چتان دەوێ دەیکەن. جا ئێستا داخواز لە ئێمە و کردەوە لە ئێوە».

بەگ بە دوودڵی و نا هومێدییەوە:

«دە جارێ، با بە ئەحمەد بڵێم، بزانم ئەو چ دەڵێ؟»

ئەگەر ئەحمەد ئەو مەرجەی قبووڵ نەکردبا، ئەوسا بەگی خۆشاب چ مەجبوور نەبوو لە قەڵای ڕاگرێ و بیپارێزێ. ئەوە ئەحمەدیش و هەموو کەسێکی دیکەش دەیزانی. هەقیش بە لای پاشادا دەکەوت شەڕێ بکا.

بەگ گازی ئەحمەدی کرد، لە حوزووری سمایل و ئەوانی دیکەدا لێی پرسی.

ئەحمەد، بێ دوودڵی و بەوپەڕی ڕووگەشییەوە، گوتی: «قایلم، چاکە، دەچمە سەر ترۆپکی ئاگری. لەوێ، شەوێ، ئاگرێکی گەورە هەڵدەکەم. پاشاش دەیبینێ. دەبا هەر لە ئێستاوە دەس پێ بکەین».

بەگی خۆشاب، گوڵبەهار، خەڵکی دیکە، ئەحمەدیان لە وەسەرکەوتنی ترۆپکی چیای ئاگری، لەو سەفەری مردنە پێ پەشیمان نەکراوە. بۆ ڕۆژی پاشێ گەردن ئازاییان لێک کرد. سوار بوون، بایزید خۆ بگرە هاتن.

گوڵبەهار و ئەحمەد لە ماڵی پیری کاروان دابەزین. سەرانسەری شاری بایزید، دەوروبەری ئاگری هەموو بە هاتنی ئەحمەد و گوڵبەهاریان زانی. ئاسنگەرەکە هاتە ماڵی پیر. لەگەڵ پیردا ئەحمەدیان زۆر نسحەت و ئامۆژگاری کرد، گوتیان:

«ئەم پاشایە کافرە، کوڕە دەیەوێ لە نێوت ببا».

هەرچەندیان کرد و کۆشا ئەحمەدیان پێ پەشیمان نەکراوە. چیاییەکانیش هاتن گەلێک لە ئەحمەد پاڕانەوە، ئەحمەد گوێی نەدا کەس.

سبەینێیەک هەستا دەستی پیری ماچ کرد، سوار بوو، بەرەو سەرا بەڕێ کەوت، چووە خزمەتی پاشا، گوتی:

«دەچمە سەر ترۆپکی ئاگری، پاشام، هەق بەلای تۆوەیە کە بەکارێکی وا



عوسمانلی بیر لە هێرشی خەڵکەکە دەکاتەوە

دژوار و چەتوونەوەت گلاندووم».

پاشا ئۆغرخێری لێ کرد.

«سێ ڕۆژان دەنۆڕنە ترۆپکی ئاگری، سەر لووتکەکەی، لە شەوێکی بێ هەور و هەلادا دەچریسکێتەوە، هەڵدەبێ».

سواری ئەسپەکەی بوو. ئەسپ ڕفاندی، بەرەو ترۆپکی ئاگریی برد.

قەڵەباڵغییەکە لە مەیدانی بایزیدێ، لە بازاڕ، لە بەر دەرکی سەرا، بەرە بەرە تا دەهات دەپەنگایەوە. خەڵکەکە لە چیا گرانتر، وەکو سێلاوێکی کپ و بێ دەنگ دەهاتنە خوار، لە نێو شاری بایزیددا تێک دەڕژانەوە و یەکیان دەگرتەوە. لە پێدەشتکانیشڕا بەرەو هەوراز، ئەوە هەر خەڵک بوون بە قەد پاڵ و ملە و بەندەنانەوە، بە کاوە خۆیان بەرەو بایزیدێ دەکێشان، دەهاتن، دەپەنگانەوە، ئێقیان دەداوە، بازاڕی شار، کووچە و کۆلانان، مزگەوتەکانیان پڕ دەکرد. کڕ و بێدەنگ دەبوون.

سمایل ئاغا دەمە و نیوڕوانی هاتە کن پاشا، پاشا لێی پرسی:

«هەروا دێن و دێن، دووایان نەبڕاوە؟»

سمایل ئاغا دەستێ بەم دیو و دەستێ بەودیودا، بە ناهومێدییەوە، گوتی: «هەروا دێن. تا دێ زیادیش دەکەن، هەڵدەتۆقن، هەڵدەقوڵێن. عەشاماتەکە عەشامات نییە، لێشاوێکە بۆ خۆی، لافاوی ئینسانە و هەڵستاوە، دەکشێ. دەکشێ و ناوەستێتەوە. پەککو ئەم چیایەی ئێمە چەندی ئینسان تێدایە، ئەم دەشتەی ئێمە چەندی خەڵک تێدایە».

پاشا گوتی:

«زۆری ئینسان تێدایە. ئەم دنیایە زۆری ئینسان تێدایە. بۆ کارێکی خێرا وا کۆ نابنەوە و بەو ڕەنگە نایەنە گۆڕێ. چۆنیان وا زوو بە چوونە سەر چیای ئەحمەدی زانی؟ لە کوێیان بیست، هەروا دێن؟ کێ خەبەری دانێ؟ تۆ بڵێی هەر بێن و بێن؟».

بەو نێو دالانە درێژە ئەستوند مەڕ مەڕ زۆر و زەوەندی سەرادا دەڕۆیی و

پێی لە نێـو فـەرش و مـافـووران نـوقم دەبـوو. دەم و چاوی درێژ بـووبـووەوە، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو چاوی کە لە نێو چرچ و لۆچان خول خول دەخولاوە و لە پێڵوویدا توێتکەی نەدەگرت، بەجارێ ڕۆچووبوو.

بەهەراسانییەوە گوتی:

«سمایل ئەدی ئەوەی لەمەڕ ئێمە کوا؟»

سمایل ئاغا لە دوودەران قەڵەباڵغییەکەی بۆ دەستنیشان کرد، گوتی:

«هۆوەتێ، لەوسەری قەڵەباڵغییەکەی، لە نێزیک گۆڕی ئەحمەدی خانییەوە، زەردی پۆشیوە».

پاشا دەستی شۆڕ بووەوە و پاشەوپاش گەڕاوە. دەیویست شتێکی بڵێ. بە شـایانی نەزانی لێی پاشگەز بووەوە. بێ ئەوەی خـۆی لە سـمـایل ئاغـای بگەیێنێ سەرلەنوێ دایە ڕۆیشتنێ. سمایل ئاغا وەستـابوو، چاوەنۆڕی ئەوە بوو پاشا شتێکی بڵێ. قەدەرێکی خایاند، پاشا لە نکاو وەستا، سەری بڵند کرد، چاوی وەکو پشکۆ گەشایەوە، لە سمایل ئاغای نۆڕی، پرسی:

«سـمـایل ئاغا، کارێکی لەگەڵ ئەو قەڵەباڵغییە نەکەین، داغانیان نەکەین، ئەدی وە نییە؟

سمایل ئاغا گوتی:

«هیـچـیـان لەگەڵ ناکەین، هەرچی سـەرباز و مـەربازمـان هەن، قشـڵـە و سوپاگەمان هەن، لەمێژە کەوتوونە نێو قەڵەباڵغییەکەوە. هەر پەنجەشیان بۆ نابەن. لە سـەرادا هەر سەد و پەنجا، دووسەد سـەرباز هەن، ئەم قەڵەباڵغییە قۆشەن و لەشکری دنیایان دەرۆست نایەن».

پاشا هەناسەیەکی هەڵکێشا، گوتی:

«دەرۆست نایەن، دە تۆ بڕۆ، بزانە هەر دێن؟»

ئەوێ ڕۆژێ بەرەو ئێوارێ قەڵەباڵغییەکە پەرەی ساند و زۆر بوو، گەورە بوو، لە سنووری شار ترازا، شێوەکەی خوارێی شار و ڕاستانەکەی باشووری شێوەکە یەکی دیکەی نەدەگرت، هەموو بە لاپاڵەکەی ئەولای گۆڕەکەی

ئەحمەدی خانییەوە ڕیز بووبوون. قەڵەباڵغییەکە لە بڕانەوە نەدەهات، لە چیاوە، لە دەشتەکانەوە، بێ پشوو دەهاتن و لە کەمییان نەدەدا.

لەپاشان سەر لە نێواری ڕەشماڵ هەڵدرا، لە پێش ڕەشماڵان ئاگرکرایەوە، بۆنی ڕۆن لەگەڵ بۆن و بەرامەی هیشکە گیا و گوڵان، لەگەڵ بۆنی هیشکە گوڵاڵان تێکەڵ دەبوون. بەڵام ئەو قەڵەباڵغییە زل و زەلامە دەتگوت بێ گیانە، ڕۆحی لەبەردا نییە، جووڵەی نەدەکرد، سرتەی لێوە نەدەهات. کڕ و بێدەنگ وەکو ڕووناکییەکی بێ سەر و شوێن بەم لاو بەولادا شەپۆلی دەدا.

ئەگەر دنیا تاریک داهات، مەحموودخان لە سمایل ئاغای پرسی:

«هەر دێن؟»

«ئەرز و ئاسمان پڕ بوون لە ئینسان. لە ئەستێرەی ئاسمان پترن. قەڵەباڵغییەکە زەوی نایگرێتە خۆی ...».

«هیچ قسە ناکەن؟»

«ورتە لە زاری کەسیانەوە نایە».

«سەیری هیچ کوێ، سەیری چیای ئاگریش ناکەن وە نییە؟»

«نەخێر سەیر ناکەن، وا دەنێوخۆ ڕۆچوون، قەڵەباڵغییەکی وا گەورە و گران دەڵێی خەویان لێ کەوتووە. هێند بێ گیانن، دەڵێی خۆڵی مردوویان بەسەردا بێژراوەتەوە. بۆرە بزاوتۆکەیەک لە ڕوخساری شتاقاندا وەدی ناکرێ.»

شەو ئەنگوستەچاو بوو. بەری ئاسمان ساماڵ، بێ هەور و هەڵا بوو. ئەستێران دەتگوت بە لاپاڵەکانی، بە ترۆپکی ئاگرییەوە داکوترابوون، هەر دەتگوت پوولەکەن و بەری ئاسمانیان گرتووە. کشوماتییەکی مردووانە بەسەر شار دادرابووەوە. ئینسانەکان هەناسەی هەناسە ئاساییشیان نەدەدا.

مەحموودخان ئەوێ شەوێ تا سبیانێ خەوی نەچووە چاو، لەنێو سەرادا هەر هاتوچۆی دەکرد و بیری دەکردەوە. بیری لە مردن و ژیان دەکردەوە. بیری لەو ئینسانانە، لەو جەماوەرە گەورە و گرانە دەکردەوە کە لەو چیا و چۆڵانە پچڕابوون، هاتبوون. ئەمانە هەموو لە پێناوی ژن و پیاوێکدا



جەماوەرێکی لە ئەستێران زۆرتر دەوری سەرا دەدا

کۆبووبوونەوە و لێرەکانە هێوربیوون. بە ڕواڵەت و لە دەرەوەت سەیر کردبان وا دیار بوون. بەڵام شتێکی زۆر لە بن ئەو کاسەیدا پەیکەی دابوو. تووڕەییەکی لە باوەڕ بەدەر جینگلی خواردبوو، خولیای سەر بەرزکردنەوەی سەد هەزاران ساڵ پەنگابووەوە. ئەو تووڕەییەی کە نەدەهاتە زمان، نەدەبزووت. ئەو تووڕەییەی کە عەشقی کوڕ و کچێکی کردبووە بیانوو. بەرە بەرە زەمان دەشێوێ و خەڵکیش بە جارێ لە تامیان دەرکرد. ئەمڕۆ بە بەهانەی کچەوە دەرکەی سەرا بە من دەگرن، سبەینێ بە بەهانەی شتێکی دیکەوە دەڕژێنە نێو شاری ئەستەمبووڵەوە و دەرکەی پادشا دەگرن. پێم وایە ئیدی وەختی هاتووە.

چارەسەرێک بۆ ئەم خەڵکە نەدۆزینەوە هەموو سەرمان تێدا دەچێ. سبەینێ بە بیانووی زوڵم و زۆرەوە، دوو سبەی بە بیانووی خەرج و باجەوە، سێ سبەی بە بیانووی کۆشک و سەراکانمانەوە، چوار سبەی بە بیانووی نانەوە، یەک دەگرن. یەک دەگرن، بەڵام چی؟ بە تووڕەیی و ئێش و ئازاری سەد هەزاران ساڵەوە، هەروەکو ئێستاش ئاوها بێدەنگ و کڕ و کپ یەک دەگرن.

ئەم قەڵەباڵغییە هێز نییە بەری بگرێ. هەرچی هۆردوو و قۆشەن و لەشکری دنیا هەن خڕکرێنەوە دەرۆستیان نایەن. ئەمانە ئەگەر بێنە ئاراوە پێشیان ناگیرێ، چارەیەک کوڕینە، بۆ ئەوەی نەیەنە ئاراوە چارەیەک.

خۆر چریسکە چریسک، لە ئاسمانێکی شۆراوی، خاوێنکراوەی ڕووناکی، سامالی بێ هەور و هەلا، لە چیا هەڵات. قەدەرێ بە لاپاڵی ئاگرییەوە لکا، پاشان لێی هەڵبڕا، دیسان پێوە لکاوە، پاشان بەتەواوی هەڵبڕا، ڕاپەڕی چوو بەرانبەر بە چیا وەستا. مەحموودخان قەتی ڕۆژ بەو حاڵە نەدیتبوو. تەنانەت ڕۆژیش حاڵی گۆڕابوو. ئیدی خان هەروا لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد و گوتی نیشانان بە دیار کەوتن، نیشانەکانی ئاخری زەمانی.

مێشهەنگ چۆن پاش گەرادانان قەدەرێ تۆپەڵ تۆپەڵ بە حەواوە خۆ شەنوکەو دەکەن و پاشان لە بنەوە تا نووک لە چڵەدارێک دەورووکێن ئەو سبەینێیە شاری بایزید بەو ڕەنگە بووبوو بە پوورەی هەنگ.

لەگەڵ گزنگی ڕۆژێ پیاوان بە کڵاوی لواوە، بە کەوڵە بزن و مامزیی هەمە ڕەنگەوە، بە پۆستە جوانووەوە، سمێڵ درێژ، بەژن بڵند، ژنان بە کراسی یەک لەسەر یەکەوە، بە شەدە هەوریی هەزار و یەک ڕەنگی، بە تارا و سلسلە و پلپلەی زێڕ و زێوەوە، چاو چاوی کارمامز، ڕەش، گەش، بەنگی، دەست و مەچەک ناسک، لەگەڵ گزنگی ڕۆژدا پێکەوە هاتنە جۆش و کوڵ. دیسان کڕ و کپ بوون، دەنگیان لێوە نەدەهات.

قەڵەباڵغییە وەجۆش هاتووەکە، دەمە دەمی چێشتانێ لەپڕ گۆڕانێکی بەسەردا هات. تێکڕا هەموو ڕوویان بەلای ئاگریدا وەرچەرخان و بێ چاو ترووکاندن چاویان بڕییە ترۆێکی چیاکە و هەموو دایانە چاو قایمی و هەروا مانەوە.

مەحموودخان خۆی ئەوەی دیت. زۆریش ترسا:

«ئەرێ سمایل ئاغا، ئەمانە هیچ قسە ناکەن؟ وا نییە؟»

«پاشام، قسە ناکەن، هەر وەستاون، بێ چاو تروکاندن تەماشای چیا دەکەن. قەدەرێکیش دەستیان بۆ ئاسمان بڵند کرد، کڕ و لە سەرەخۆ پاڕانەوە».

تا سێ ڕۆژان چاوەڕێ دەکەن، ئەگەر ڕووناکییان لەسەر لووتکەی ئاگری بەدی نەکرد، ئەوە ڕێ ڕاست دێنە زگ سەرا دەیرووخێنن، تەختی دەکەن، داری بەسەر بەردییەوە نایەڵن.

مەحموودخان ئیدی هەروا لە هیچە تۆقیبوو و لە دڵی خۆیدا گوتی، من لە ترسان وا بیر دەکەمەوە، کێ دەڵێ وا دەبێ.

«سمایل ئاغا، هەر دێن؟»

«هەردێن، تا دێ، زۆرتر دەبن. ئەم خەڵکە لەکوێوە دێن؟ کێ دەیانهێنێ؟»

مەحموودخان زریکاندی، گوتی:

«ئەو مەندەبوورە، ئەو پیری کاروانە بێ خوایە، ئەوانە، ئەو پیرانە هەمیشە دژمنی ئێمە بوون. سمایل ئاغا، ئەمانە نەگرینە خۆمان تێدا دەچین. سمایل

ئاغا، ڕەگیان قووڵ ڕۆچووە، ڕەگی سەد هەزار ساڵیان لەنێو خەڵکدا داکوتاوە. ئەگەر لەگەڵیان یەک نەگرین.» لە پەنجەرەکەوە خەڵکەکەی پیشان دا، «ئەدی، ئاوها دەبێ سمایل ئاغا».

«ئێمە هەموو وەختێ دەتوانین لەگەڵیان یەک بگرین پاشام».

مەحموودخان بیری کردەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: دەڵێی ماڵ و منداڵەکەم، دەستە و دایەرەکەم هەموو کۆکەمەوە و سەرایێ چۆڵ کەم. بەڵام ترسنۆکی نییە؟ ئەستەمبوڵ پێ نازانێ، ئەدی پاشان. پاشان خۆ چواردەوری سەرایێ هەموو تەنراوە، تەیری لێ دەرناچێ؟ دەکرێ بە شەڕ دەرباز بم؟.

لە پڕ گەشایەوە:

«هیچ نەبێ خۆ لەم حاڵە قوتارکەم، سەری ئەو بەگی خۆشابە، سەری ئەو پیری کاروانە بپەڕێنم. سەریان بپەڕێنم. ئەم نەگریسانە نەبوونایە ئەو هەموو جەماوەرم لە سەرایێ تێ نەدەورووکا. لە سەریان دەدەم، لە سەریان دەدەم. لەسەریان دەدەم سمایل ئاغا. با ببینن با ببینن».

تا هێزی تێدا بوو دەیقیژاند، دەماری ملی ڕەپ بووبوون، هەر ئەوە بوو نەدەبووراوە. هەر گوتی و گوتی، پاشێ بەرە بەرە خاو بووەوە. بەکاوەخۆ، کڕ و بێدەنگ، هەر دەیگوت: «لەسەریان دەدەم، لەسەریان دەدەم، لەسەریان دەدەم خۆم لەو بەڵایە ڕزگار دەکەم».

سمایل ئاغا لە کن دەرکەی پشتی بە کۆڵەکە مەرمەڕێکی پەمبەییەوە دابوو، چاوەنۆڕی خاوبوونەوەی مەحموودخانی بوو.

«سترانبێژ و بلوێرئەنگێوانیش هاتن، سمایل ئاغا؟»

«بە سەدان دەهۆڵکوتیش هاتوون، چاوەڕێی داوەت و ڕەشبەڵەکێ دەکەن».

«ئینشاڵڵا ئاگرەکە لەسەر ترۆپکی چیا هەڵدەکرێ، سمایل ئاغا، یانە... »

مەحموودخان شەرمی بە خۆدا هاتەوە کە گرێی دەروونی خۆی، ترسی خۆی یەک جار بەو ڕەنگە لە بۆ نێزیکترین کەسێکی وەکو سمایل ئاغا کردەوە. یەک دوو شتانی لە زاریدا جوییەوە، ویستی زمانی بگۆڕێ بۆی

سەروبەر نەکرا. سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ بووەوە.

سمایل ئاغا لە پەشیمانی مەحموودخان گەیشت. ئاغا پیاوێک بوو، دڵ و زمانی وەکو یەک بوون، ڕاست و ڕەوان گوتی:

«پاشام، جەماوەرەکە ئەم شەویش ئاگرەکە لەسەر ترۆپکی چیای نەبینن خۆ ئیدی ئارامیان لەبەر دەبڕێ، دێن دار و پەردووی سەرا و مەرامان تێکوپێک دەدەن و هەموومان دەکوژن. جا بۆ لە یەکدی وەشێرین، با چارێکی بکەین».

مەحموودخان ئەگەر ئەو قسەی بیست، هەر ئەوە بوو شاگەشکە نەبوو، پرسی:

«چۆن؟ چۆن چارێک سمایل؟»

«واز دێنی. لە کەلی شەیتانی دێیە خوار و ئەه. دەچییە بەر دەرکەی، دەڵێی مادامێکی ئەو هەموو خەڵکە وای دەوێ، ئەوا لەبەر خاتری ئەم جەماوەرە لە مەرجی خۆم پەشیمان بوومەوە. کچەکەم پێشکێش بە ئەحمەدی کرد. ئەحمەدی بێنن، با بیکەین بە شای و لۆغانێ. دەشڵێی: هەر لەبەرخاتری ئێوە سەروبەری شاییەکەش هەر خۆم دەیکەم. جا ئەوسا بزانە خەڵکەکە چۆنت لەسەر سەری خۆیان دادەنێن و حەڵوا حەڵوات پێ دەکەن و لە پاش خوا ئەتۆ دەبی. هیچ چارێکی تر نییە».

«کاری وا ناکەم، سمایل ئاغا، نۆرەی ئەوەمانە پێمان بڵێن ترسنۆکن».

«پاشام، شتی وایان قەت بە بیردا نایە. جەماوەر قەت بیر لە فیتنە و فەسادی ناکەنەوە. دڵپاکن. نیهاد خاوێنن».

«سمایل، بە بیریاندا دێ. کەس لە جەماوەر زیرەکتر نییە. شتی وەکو جەماوەر نەهاتووەتە دنیاوە».

«پاشا، بە هەڵەدا چووی، سەرا ڕووخاندنیان بە کەڵک نایە. بەڵام بیشیڕووخێنن لەبەر ناچارییە. هەر کە بەسەریاندا هات چ دەڵێی.

کە ناچار بوون دەمانکوژن. لەوانەیە تا ئێستا ئەحمەدیش نەمابێ.

کێ دەڵێ ئاگری ئەویشی هەڵنەلووشیوە؟ بەڵکوش،»

«ڕاست دەڵێی، هەقتە، هەقتە، بەڵام نایکەم سمایل. لە قسەی خۆم پەشیمان نابمەوە».

«ئەوانیش دەترسن. بەڵام زۆریان کەیف بەوەدا دێتەوە تۆ واز لە مەرجەکەی خۆت بێنی. جا بۆیەش ئەوەیان بە بیردا نایە کە ئێمە لێیان دەترسین. بە پێچەوانەوە، بە پەرستن دەتپەرستن، خێرخوایی و چاکەپەروەریت بە حەلحەلەی ئاسمان دەگەیەنن. دەبییە داستانی سەرزاری گەورە و چووکیان».

«ئەمکردووە و نایکەم، لە دەستم نایە، سمایل ئاغا. با بمکوژن. هەم، هەم، هەم، کێ دەڵێ وەسەر ترۆپکی چیا ناکەوێ. بەشکو لەوانەبێ ئەمشەو ئاگرەکە ببینین.»

سمایل ئاغا زریکاندی: «نەبووە و نەکراوە، ئاگری، هەرچی وەسەر ترۆپکی کەوتبێ دەم و دەس گرتوویە و کردوویە بە بەرد.»

«پیری کاروان خاوەن بەهرە و کەرامەتە. بەڵکو کەرامەتێ.»

«ئاگری گوێی لە کەرامەت و مەرامەت نییە. ئاگری دەرفەتی بێبنکردنی ترۆپکی خۆی بە کەس نادا».

«جا بەڵکو نەگاتە سەر ترۆپکەکەی، هەر لەو خوارانەوە ئاگرەکە هەڵکا».

سمایل ئاغا دەستێکی بە ڕدێنیدا هێنا. بزە گرتی، پەنجەکانی تەقاند، گوتی:

«ئەحمەد بوێر و ئازایە، ئەگەر چوو سوور دەیزانی دەمرێ. هەر دەگاتە ترۆپک».

«دە منیش لە بڕیاری خۆم نایەمە خوار سمایل ئاغا، لە بەڵێنی خۆم پاشگەز نابمەوە. بە دەم شەڕەوە دەمرم. بڕۆ سەربازان تەیار کە. هەرچییەکی لە قشڵەشدا هەن ڕایانگوێزنە سەرایێ، بەدەم شەڕەوە دەمرین».

«دەرفەتی شەڕکردنمان بە دەستەوە نامێنێ پاشا. ئەمن دەزانم ئەو جۆرە جەماوەرە چین. هەر هێندەی چاو قووچاندنێ یەکمان بە ساغی نایەڵن، هەموومان تەفروتوونا دەکەن».

پاشا سووربووەوە، گوتی: «با تەفروتوونامان کەن، ئێمەش لەو ماوەی چاوقووچانەدا بە هەموو توانامانەوە شەڕ دەکەین. هەڕۆ سەربازان ڕاگەیەنە، ئامادەبن، ئەوانی قشڵەش با بێن».

سمایل ئاغا ئیدی قسەی نەکرد. قسەی چی کردبا، دەیزانی پارە ناکا. جگە لە جێبەجێکردنی فەرمانی وی ج چارێکی دی نەبوو.

ئێوارێ بوو، تاریکی دادەهات. دەشتەکەی خوارێ لەبەر ئینسان ڕەش ڕەش دەچووەوە. هەر خەڵک بوو و دەهات، هەر دەوار و ڕەشماڵان بوو هەڵدەدرا. لەپێش دەوار و ڕەشماڵان، ئەستێرە، ئەستێرە، دەست بە ئاگر هەڵکردن دەکرا. تاریکی داهات و دانەهات جەماوەرەکە هەڵستا. چاویان بڕییە ترۆپک و لووتکەی چیای ئاگری. ئەو هەموو مەردمە بووبوون بە یەک دڵ و چاوەڕێ بوون. بە چاوە، چاوە هەر چاوێکیان بووبوو بە چوار.

مەحموودخانیش لە کۆشک و سەرای خۆی چاوەنۆڕی ئەو ئاگرە بوو.

لە لایەک جەماوەرەکە، لەلایەک مەحموودخان، گیانیان هاتبووە سەر لێوانیان چاوەڕێی ئەوە بوون، ها، ئێستا ها، نەختێکی تر موجیزە و پەرجوو لە ترۆپکی چیای ئاگری هەڵدێ.

کەڵەشێری نیوە شەوێ خوێندیان. جگە لە ئەستێرە خەرمانکراوەکانی سەر ترۆپکی چیای ئاگری کە پێوە سووابوون تروسکەیەکی دیکە وەدی نەدەکرا. ئاسۆ ڕوون بووەوە، ئەستێرەی کلکدار ورشە ورش، چریسکە چریسک لە چەرخی شینی خۆیدا خەرمانەی دا هەر دەتگوت مانگێکی دیکەی زۆر سەیرە لە نێزیکی ئاسۆوە. سمایل ئاغا وەکو با گەڕایەوە. لە ئارەقەدا چۆڕەی دەهات، گوتی: «وا ئێستا دەستیان بە غەڵبەوهەرا کرد، لەسەرەخۆ گەڕانەوە سەرایێ. نەک هەمووشیان، بەشێکیان».

مەحموودخان هەردوو چاوی بووبوون بە کاسەی خوێن. دەستێکی بە مشتووی شیرەکەوەی، ئی دیکەی بۆ دەمانچە زێڕکفتە، مشتوو ماهییە، چەخماخلییەکەی بەریشتی دەچوو. بەدرێژایی ئەوێ شەوێ دەستی بەو ڕەنگە هەر دەهات و دەچوو و چاویشی لە ترۆپکی ئاگری بوو.

«هیچ چارێکی تر نییە پاشام، هیچ چارێکی دیکەی قوتاربوون ... »

پاشا خاو بووەوە. بە هەموو گورێکییەوە، قورس و گران، بەلۆژەلۆژ، هێز لەبەر براو، سا بە هەر جۆرێکی بوو خۆی گەیاندە بەر دەرکەی سەرا. لەپێش دەرکەی مزگەوتەوە ڕەت بوو، لە حەوشەییەک دوو جار قاچ و قولی تێک ئالآن، ویستی بگەڕێتەوە نەگەڕایەوە. هاتە بەر دەرگانە سەر بە کەمبەرە زەلامە بە نەخش و نیگارە لە ئەقڵ بەدەرە سوولجوقییانەکەی حەوشێ. جەماوەرەکە ئەگەر دیتیان لە غەڵبە و بۆڵژن کەوتن و کڕ و کپ، ورتە لە بەردەوە دەهات لەوانەوە نەدەهات. تەنانەت پشووشیان نەدەدا. مەحموودخان بە چاوە زەلامەکانی جەماوەرەکەی دابێژا. جەماوەری تاین بە کاوەخۆ، وەکو دەریای پاش مەد و جەزران دەهەژا. پاشا بەرەو تەپۆلکەی پێش سەرای چوو، بە تەپۆلکەدا هەڵگەڕا، گوتی:

«لەبەر خاتری ئێوە وا ئەحمەدم بەخشی. شاییەکەشی خۆم سەروبەری دەکەم. مادامێکی ئەو هەموو خەڵکە، ئەو هەموو مەردمە هاتوون. هەر ئێستا پیاو دەنێرم ئەحمەد بێننەوە. کێهەتان لە هەمووان سوارچاکترە، کامەتان لە هەمووان چالاک و چاپکترە بڕوا، بە فریای ئەحمەد کەوێ، پێی ڕاگەیەنێ، پاشا وازی هێنا».

جەماوەرەکە لە ناخەوە وە غەڵبە و غرێو کەوتن. یەک دوو جاران لەم سەریرا تا ئەو سەری، شەپۆلی دا. جەماوەرەکە وەکو ژێی کرژ هەڵاتووی لێ بەسەرهاتبوو. خاو دەبووەوە، دەرەوییەوە. پاشا سۆسەی ئەوەی کرد.

بە ڕواڵەت شاییی بە خۆبوو، لە دەروونیدا دڵی توقیبوو، لە تەپۆلکەی هاتە خوارێ، بە هەنگاوی قورس و گران وە ژوور سەرایێ کەوت. پیاوەکانی سێ هەنگاوی لە دووەوە دەڕۆیشتن.

ئەگەر پاشا وەژوورکەوت و نەکەوت برێ لاوی خوێن گەرم، هەندێ بە سواری، هەندێ بە پیادە ملی ڕێگای چیای ئاگرییان گرت. جەماوەرێک وەکو بفرێ بەرەو ئاگری هەڵکشان.

ئەوێ ڕۆژێ جەماوەرەکە خاوبووەوە، دەستیان بە قسان کرد. بایزید وەکو



مەحموودخان لە ترسان ئەحمەد دەبەخشێ

پووره هەنگێکی زەلام ژاوەی دەهات. ئینسانەکان دەستێ بەم دیو و دەستێ بەو دیودا سست و خەفەخان بەو بەر ڕۆژەوە بۆ خۆشیان نەیاندەزانی چ بکەن، بۆ کوێ بڕۆن، هەر دەخولانەوە و دەوەستان.

ئاسنگەر چووبووە نێو جەماوەرەکەوە، بە شادییەوە دەیگوت: «کافرەکە ئیمانی هێنا، ئاخرییەکەی ترس وەئیمانی هێنا. زانی کۆشک و تەلارە زێڕەکەی، سەرا مەڕمەڕ و زێوەکەی وێران و خاپوور دەکرێ. ئەو کافرە لێی عەیان بوو بۆیە بە چۆکدا هات».

جەماوەرەکە هەموو سەرسام دەیانڕوانییە ئاسنگەر.

«ئێمە ئەگەر لە هەموو شتێکدا وا یەک بگرین، کەس ناتوانێ دەممان تێ نێ. ئێمە چیا، شا بەرگەمان ناگرێ. هیچ کەس. هەر ئەوەندە یەک بگرین ئیدی بەسە».

هەندێ کەس، لەوانی سەر بە سەرایێ لە پشتەوە دەیانگوت: «ئاگرپەرستی، دین دژمن. بە تۆچی؟ ئێمە یەک بگرین یا نەگرین، تۆیەکی ئاگرپەرست.»

ئاسنگەر گوێی لە قسەی ئەوانی پشتییەوە نەبوو.

ئینسانەکانی ئەو دەشتە جارێ وەسەر شاری دەکەوتن، جارێ دەهاتنە خوارێ، ئارامیان لەبەر بڕابوو، چاویان بەڕێوە بوو کەی خەبەرەکە لە ئاگرییەوە دەگا. هەر لە مێستاکەوە هەندێ کەس لە چاوەڕوان کردن جاڕس و وەڕز بووبوون، لێیان دابوو گەڕابوونەوە گوندی خۆیان. تا درەنگتر دەبوو ئەوانی کە بۆ گوندان دەگەڕانەوە، یا هەڵپەی گەڕانەوەیان دەکرد زۆر دەبوون. چاوەڕوانەکە، تووڕەییەکە شتێکی زۆر کەمی مابووەوە.

دیسان ئێوارە داهات، ڕۆژ ئاوابوو، هەرا و غەڵبەی بەزیوی وەڕزبووی جەماوەرەکە، وەکو لە ناخەوە، لە ناخی زەوییەوە، بێ، گەورە بووەوە. تەنیا ئەو کەسانەی کە مەراقداربوون، ناوبەناو سەریان بڵند دەکرد و تەماشایەکی ترۆپکی چیای ئاگرییان دەکرد. مەحموودخانیش هەر نیو سەعات جارێ، سەعاتێ جارێ دەچووە بەر پەنجەرە و دەینۆڕییە ترۆپکی چیای. بەڵام تەنیا پیاوێک هەبوو، ئێستا و ئێستاش چاوی لە ترۆپکی ئاگری نەترووکاند، ئەویش

ئاسنگەرەکە بوو.

دەیگوت، کۆمەکم کردووە، ئاگری نایگریّ ڕیّ و ڕاست دەیگەڕێنێتەوە. لەبەر خاتری کڵپە و بڵێسان، پیر و پیاو چاکان ئەحمەدمان بۆ دەنێرێتەوە.

ئەویّ ڕۆژیّ ئێوارەی چوارەم ڕۆژ بوو. لەنکاو زریکەی ئاسنگەر پەردەی شەوی دڕی، پاشان هەرایەک وەکو تەقینەوەی تۆپ لە چیای ئاگری دەنگی دایەوە. چیا ڕاچەنی، لەرزی هەرا و زیریکە لە شیو و دۆڵانەوە وەکو تۆپ تەقینەوە. هەموو سەیری ترۆپکی چیای ئاگریان کرد. ترووسکە ئاگرێکی باریک لەسەر ترۆپکی چیا گەشایەوە. هەندیّ جار ون دەبوو، لەپڕ پەیدا دەبووەوە. دیسان ون دەبوو.

مەحموودخان گوتی:

«ئاگری ئەحمەدی نەگرت، چ بوو؟»

سمایل ئاغا گوتی:

«ئەحمەد ئاگرییاییە، لە خۆیەتی هیچی لیّ ناکا».

مەحموودخان قیژاندی:

«درۆیە، ئەمە شتێکی تێدایە».

بۆ سبەینیّ زوو ئەحمەد نیشتبووە ئارەقە و خوێن بە سواری ئەسپ قوت بووەوە، هات لە پێش دەرکی سەرا وەستا.

جەماوەرەکە هەر چوار دەوریان تەنی. ئیزنیان نەدا لە سەرایێ بچێتە ژوور. بۆ دووکانی حوسێی ئاسنگەریان برد. ئەحمەد دەستی حوسۆی ماچ کرد.

«پیران دەستیان بە باڵتەوە گرت. هەمیشە پیرانت لە پشت بن.» ئاورینگانی بە سەردا پرژاند و پیرۆزی کرد.

گوڵبەهار هاتبوو لە سووچێکەوە ڕاوەستابوو. ئەحمەد هەر تەماشای نەکرد. گوڵبەهار بەم ڕەفتارەی زویر و زگار بوو. قسەی نەکرد. تۆ بڵێی وابیّ؟ جا ئەگەر وابوو ئەم پیاوە بۆچی لە ڕۆحی خۆی بوورد و چوو لەسەر ترۆپکی چیای ئاگری، ئاگری هەڵکرد.

گوڵبەهار لە هەموو شتیّ حاڵی بووبوو. خۆشەویستییەکەی بە عەینی

ئەندازە بەرەو ڕک و کین دەڕەوییەوە. هەر لە دووی ئەحمەد وەدەرکەوت گوتی:

«ئەحمەد با بڕۆین».

ئەحمەد گوتی:

«بڕۆین».

نەچوونە سەرایێ. سەیری جەماوەرەکەیان نەکرد. چاویان بەو داوەت و شاییەی بۆیان تەدارەک کرابوو، نەکەوت. دەستی پیری کاروانیان ماچ کرد، سواری ئەسپەکانیان بوون، سەرلەنوێ دایانکێشا، بەرەو چیا گەڕانەوە.

گۆلێک بەسەر سینگی چیای ئاگرییەوەیە، هەر هێندەی جێ جۆخینێ گەورەیە. ئاوەکەی تا بڵێی شینە. هەموو ساڵێ کە بەهار بەسەر دنیادا دەدا، سبەینێیەک، پێش ئەوەی ڕۆژ هەڵێ، تێکڕای شوانەکانی چیای ئاگری دێنە سەر ئەم گۆلە. کەپەنکەکانیان بەسەر تەقتەقە تاوێری سوور، ڕک، ڕژد، بەسەر گڵی مس ڕەنگی گۆلەکەدا رادەخەن، لەسەر خاکی سەودای هەزار ساڵە دادەنیشن و بە بلوێرەکانیان هەموو بەیەک پشوو توورەیی چیای ئاگری دەژەنن. هەرکە ئێوارێ دادێ، باڵندەیەکی سپی دێ، زۆر چکۆلانە، باڵێکی لە شینایییەکە وەردەدا، دەفڕێ و دەڕوا.

لە پشتەوە، نەختێ لەولاوە. سێبەری ئەسپێکی زەلام، بەرەو گۆلەکە دەکشێ. هەر کە دێ و نایە، گورجێ لە چاو ون دەبێ. ئەگەر ڕۆژ ئاوا دەبێ و نابێ شوانەکانیش لە پڕ لە بلوێرژەنین دەوەستن و لە نێو تاریکایی چیای ئاگریدا ڕەنگیان دەچێتەوە و ون دەبن و لەگەڵ تاریکیدا تێکەڵ دەبن.

سەری ئەسپەکانیان کێشا پێش ئەو ئەشکەوتی کە لە سەرووی گۆلی کوویەوە بوو. چادر و ڕەشماڵێکی زۆر لە ڕاستانی سەر ئەشکەوتێ، لە لاپاڵەکانی خوارێ هەڵدرابوو. چرا کزەکانی نێو چادر و ڕەشماڵان بە ئاگرییەوە وەرکرابوون، ترووسکە تروسکیان بوو. دەوروبەر بۆنێکی هێند تیژ و تاڵی لێ دەهات، پیاوی مەست و گێژ دەکرد. بۆن و بەرامەی مانگی نەورۆز، تیژ تیژ، لەو نێوە پەنگابووەوە. هەر بۆنەی وەکو بۆنی سێوە کێویلەیەکی کۆن و سیس دەچوو. گژ و گیای هەڵقرچاو، گولاڵەی هەڵپرووزکاوی بە هێز،



گوڵبەهار و ئەحمەد ڕزگاریان دەبێ و
دەگەڕێنەوە چیای ئاگری

کورتیله کورتیله، کوڵەبنە، کوڵەبنە، خشەخشیان بوو. ئەسپەکانیان بە دەوەنێکەوە بەست، ئەحمەد بە بەردەستێکەی ئاگرێکی هەڵکرد، گوڵبەهار گــزرە ئاردووێکی هیـشکی دار و دەوەن لە دەور و بەران خــڕکــردەوە. هەردووکیان لە لێو ئاگرەکە، بەرانبەر بە یەک دانیشتن، ئەحمەد نان و پەنیری سەوزی لە هەگبە دەرێنا. دوو بە دوو دەستیان بە خواردنێ کرد. ورتە لە دەمی شتاقیانەوە نەدەهات، نەیاندەنۆڕییە نێو چاوی یەکدی. تەنیا ئەگەر ئاگرەکە ڕووی لە کوژانەوە دەکرد، گوڵبەهار هەڵدەستا دەچوو باوەشێکی ئاردوو دێنا. دووکەڵ گنجی نێو کەپووی دەزووراندەوە، بەڵام هیچیان بە خۆیان نەدەزانی.

لە نواڵەکەی دوورەوە گرم و هۆڕێک دەهات، ئەو چیایەی دەهەژاند. دەتگوت بە سەدان شەپە و هەرەسە بەفر هەرەسیان هێناوە و دەتەقێنەوە. مەڵێ ئەمە دەنگدانەوەی ئەو هەرەسە سەهۆڵانە بوون کە لە لووتکە و ترۆپکی چیاکانەوە هەرەسیان دێنا و بەرە بەرە دەنگیان گەورە دەبوو.

جا، هەموو وەرزێ، هەرەسە سەهۆڵی وا زەلام، کە یەکی هێندەی چیایەکی چکۆڵە دەبێ، غلۆر دەبنەوە و لە نواڵ و شێو و دۆڵان گرمەیان گەورە دەبێ و دەنگ دەدەنەوە.

گوڵبەهار بە ترسێکەوە، بە پەژارە و کوڵ و نسرینەوە، چەنەی لەسەر چۆکی دانابوو و بۆ خۆی هەڵترووشکابوو، هەر هێندەی گلۆڵەیەکی مابووەوە.

باگەڕ و زریانێک لە دەرێ هەڵی کرد، هات و رابرد. بوو بە ساماڵ، پاشان هەوا لەنکاو ڕەوییەوە و خۆش بوو. شەوگار ڕاشکا. ئەوان هەر بەو ڕەنگە بەرانبەر یەک دانیشتبوون، چاویان بڕیبووە ئاگرەکە و هیچی تر.

نەئەمیان دەیتوانی دەس بە قسان بکا، نەئەویان. ڕک و تووڕەیی گوڵبەهار تا دەهات پتر هەڵدەتۆقی. ئەوین و سەوداسەرییەکەی چەند بە ڕەگ و ڕیشە بوو و قووڵ و ڕۆچوو بوو ڕک و تووڕەیییەکەشی بەو ئەندازەیە هەڵدەچوو و سەرڕێژی دەکرد. لە نکاو تەقییەوە، گوتی:

«بیڵێ ئەحمەد، ئەتوو شتێکت لە دڵیدایە، بیڵێ».

ئەحمەد چاوە گەورەکانی بە شلەژاوییەوە کردەوە، لە حاڵی گوڵبەهار گەیشت. دەتگوت چەندین ساڵە، تازە گوڵبەهاری دەبینی، دەتگوت دەیەوێ یەکێکی زۆر لەمێژ ناسیاوی وەبیر بێنێتەوە، شتێکی وای لە ڕوخساردا وەدی دەکرا. ئەحمەد قسەی نەکرد، نەیتوانی چ بڵێ. دەنگی گوڵبەهار وەکو سووتمان و ئاگرکەوتنەوەیەک دەچوو. دەبوو وەرامی بدرێتەوە. ئەحمەد چاوی بڕیبووە ڕوخساری گوڵبەهار و دەمی چووبووە کلیلە، متەقی نەدەکرد. پاشان وەکو گیانی لە بەدەن بکێشن، گوتی:

«چۆنت ڕزگار کردم، گوڵبەهار؟ چت بە مەمۆ دا سەرمت پێ کڕییەوە؟ مەمۆ لە پای چی خۆی بەخت کرد و سەری منی ساندەوە؟ چما کاتێکی منی قوتار کرد بە مەرگی خۆی نەدەزانی؟ ڕاستیی ئەوەم پێ بڵێ. دەیزانی، نەیدەزانی؟»

وەستابوو لە گوڵبەهاری دەنۆڕی، چاوەنۆڕ بوو.

گوڵبەهار گوتی:

«دەیزانی. دەیزانی کە هەر زیندانەوانێک دەرکەی زیندانی بۆ زیندانییان وەکا لە چ جێیان لەسەر ئەو دنیایەی ناژی. پەنا وەبەر هیچ وڵاتێکی نابا، مەمۆ بۆ خۆی ئەوەی زۆر چاک دەزانی. هەر بۆیەش بەدەم شەڕەوە تا ئاخر پشوو خۆی بەخت کرد لە برجی قەڵاوە خۆی هەڵداشت».

«زێڕت دایە، دەستی لە ڕۆحی خۆی هەڵگرت؟»

«نەء».

«کۆشک و سەرات پێ بەخشی، سەری خۆی دا؟»

«نەخێر»

«ئەدی چت دایە گوڵبەهار، لە پێناوی چدا گیانی خۆی بەخشی؟ بۆ گیانی بە گیانێ گۆڕییەوە؟»

«هیچم نەدایە ئەحمەد، هیچی نەویست».

«بۆ قوتارکردنی من؟»

گوڵبەهار قسەی پێ بڕی، گوتی:

«پێم گوت چت دەوێ دەیدەم، بۆ قوتارکردنی تۆم بوو. هیچی نەویست».

«تۆ پێت گوت، چت دەوێ دەتدەمێ، وەها؟»
«گوتم، چت دەوێ دەیدەم، ئەو هیچی نەویست».
کڕ و بێ دەنگ بوون. ئاگرەکە بەرە بەرە دەکوژاوە بەش بە حاڵی گوڵبەهار هەموو شتێ بڕابووەوە. زۆر چاک لە نیاز و دۆزی ئەحمەد گەیشتبوو.
ئەحمەد هەڵستا وربەی سەر ئەسپەکەی هێنا، گیا و گوڵی ڕاخست. لە پووش و پەڵاشی بۆن تیژی چیای ئاگری سەرینی دروست کرد. شیرەکەی هەڵکێشا لە ناوەندێی درێژ کرد. شیر لەبەر تروسکە مردەڵەی ئاگرەکە مات مات بریقایەوە. ئەوجا ڕاکشا، وربەکەی بە خۆیدا دا.
گوڵبەهار وەدەرکەوت. هەمبێزێ گزرەی هیشکی دیکەی هێنا. ئاگر بڵێسەی ساند. مات، حەسرەتاوی، تامەزرۆ، لە ڕوخساری ئەحمەدی ڕوانی. هەر دەیڕوانییە سەر و ڕوخساری و ڕوانینی دەهاتێ، لێی تێر نەدەبوو. هەرچەندی تەماشا دەکرد، هێندەی دیکە سەودای و حەوزەڵ دەکەوت و پتری پەرە دەستاند. لە نێو بێ چارەییدا بە جارێ کرژ هەڵاتبوو و بەسەر یەکدا داقووپابوو. هەموو شتێ، هەموو شتێ بڕابووەوە. ئەو ئازارە ترسناکەی لە ناخەوە هەست پێ کرد. بەرگەی نەدەگرت. جا چیی کردبا؟ بۆ کوێ چووبا؟ پەنای وەبەر کێ بردبا؟ تا نێو مۆخی هێسکانی پڕ بووبوو لە ئەوین و سەودا. ئایا بە ڕاستی حەزی لە ئەحمەد کردبوو؟ ئەگەر حەزی لێ کردبایە بە مەرگی خۆی قایل دەبوو. مەمۆی...
چووە دەرێ. ساتمە و سەرەنگرێی دا. ئەستێران خرۆشان. جارێ وەسەر ئاگری دەکەوتن جارێ دەهاتنە خوار، ئاگری نەوی بووەوە، بڵند بووەوە، لەگەڵ ئەستێران تێک چڕژان، تێک ئاڵان، تێک جۆشان. نرکاندی، ڕاچەنی، کرماندی، ڕووخا. گوڵبەهار بە باوەشێک گزرەوە گەڕایەوە ژوورێ. ئاگرەکە گڕی ساند، دەم و چاوی ئەحمەد هێندەی دیکە جوانتر بووەوە، زیاتر وەسەوداکەوت. ئەحمەد نوستبوو. بە خولیای سەوداوە هێندەی دیکە وەکڵپە و بڵێسە دەکەوت، دەکەشاوە، گەورەتر دەبوو. گوڵبەهار کرژهەڵات. دنیا دەخولاوە کەور و کاشەی ئەشکەوتەکەی بە ناڵە و هات و هاوارێکی

ترسناکەوە لێک دەقڵیشانەوە و لەبەر یەک هەڵدەزڕان، ئەستێران لە دەرێ دەفڕین، دەخرۆشان، دەوروبەر هار ببوبوو، دنیا خرابووبوو، قیامەت هەستابوو. گوڵبەهار لە تاریکیدا غەرق بوو. تەنیا دەم و چاوی ئەحمەد دیاربوو. گوڵبەهار دەستی بۆ خەنجەرەکەی چوو. خەنجەر بە دەستییەوە سارد بووەوە، تا قۆڵی ماندوو بوو، کەوتە خوارێ. ئەگەر چاوی هەڵێنا ڕۆژ هێدی هێدی ڕوون دەبووەوە. یەکەم شنەبا، بۆن و بەرامە تیژەکانی بە هەر چوار لادا داغان دەکرد. گوڵبەهار ئەحمەدی لە نێو تۆپەڵە تیشکێکدا، لەسەر زنارەکەی پێشەوە دیت، نیشتبووە نێو تاریک و ڕوونەکە.

بەرەو ئەحمەد چوو:

«ئەحمەد، ئەحمەد، ئەحمەد، وەرە مەڕۆ ... ئەحمەد، ئەحمەد.»

سەرانسەری چیای ئاگری دەنگی دایەوە. بە سەدان هەرەسە بەفر لەسەردا شەپەی هێنا بۆ نێو نوالان، بۆ نێو گەلیان. چیا لە ناخی ناخییەوە ڕاچڵەکی. گوڵبەهار چەندی لە ئەحمەد نێزیک دەکەوتەوە، ئەحمەد هێندەی لێ دوور دەکەوتەوە. ئەگەر ڕادەوەستا، ئەویش ڕادەوەستا، ئەگەر دەڕۆیی، دوور دەکەوتەوە، بڕۆ تا گەیشتە گۆلی کووپە. گوڵبەهار ئەحمەدی لە گۆلی کووپە ون کرد. هەردوو دەستی بە لاجانگییەوە گرت لەسەر خۆڵە مس ڕەنگەکەی گۆلی کووپە دانیشت. چاوی لە ئاوە شینەکە بڕی.

ئیتر لەوێ ڕۆژێوە هەرچی بەکن گۆلی کووپەدا تێ دەپەڕێ، تەماشا دەکەن، گوڵبەهار، کەزییە درێژە ڕەشەکانی، کە وەکو ڕووناکی دەکشان، بەسەر پشتیدا شۆڕ کردوونەوە و هەردوو دەستی بە لاجانگییەوە گرتووە و سەیری نێو ئاوە شینەکە دەکا.

ناو بەناویش ئەحمەد لە نێو ئاوی گۆلەکەدا دێتە پێش چاوی گوڵبەهار، گوڵبەهاریش باوەشی بۆ دەکاتەوە، بەرەو پیری دەچێ، هاوار دەکا:

«ئەحمەد، ئەحمەد!» دەنگی لەو چیا و چۆڵە دەنگ دەداتەوە. دەڵێ «ئەحمەد، ئەحمەد. ئەتووش بای لە جێی من، هەر وات دەکرد، ئیدی بەسە، دە وەرە، ئەحمەد گیان، ئەحمەد گیان، ئەحمەد گیان.»

گۆل دەکولێ، هەڵدەقولێ، ئەحمەد دەسڕدرێتەوە، گولبەهار دەسڕدرێتەوە، مەلێکی سپی دێ باڵێکی لە ئاوە شینەکە وەردێنێ. پاشان سێبەرێکی ڕەشی ئەسپێک بەسەر گۆلەکەدا دەکشێ و دەڕوا.

هەموو ساڵێ، کە بەهار بە تارای گوڵاڵان دەخەملێ، دنیا وەگرڕوگاڵان دەکەوێ، شوانەکانی چیای ئاگری لەهەر چوار کەنارەوە دێن، کەپەنەکەکانیان لەسەر خۆڵە مس ڕەنگەکەی گۆلی کووپە ڕادەخەن و لەسەری دادەنیشن.

لەگەڵ سوورایی ئاسۆدا بلوێرەکانیان لەبەر پشتێنەکانیان دەردێنن، توورەیی ئاگری دەژەنن، سەودا و ئەوینی ئاگری لێ دەدەن، تا ڕۆژ ئاوا دەبێ، جا هەنگێ مەلێکی سپی........



هەموو ساڵێ لە بەهاردا باڵندەی سپی باڵی خۆی لە ئاوی گۆلی کووپە سێ جاران وەردەدا

## فەرهەنگۆک

أ

ئاپۆرە: قەرەباڵغ.

ئاخاوتن: قسەکردن.

ئاران: دەشت، تەختان.

ئاردوو: ئاوردوو، سووتەنی.

ئاژوای: لێی خوڕی.

ئاسەوار: شوێنەوار.

ئاکار: ڕەوشت.

ئاکام: ئەنجام.

ئاورینگ: پریشکی ئاگر.

ئاویتبا: بهاویشتایە.

ئاوێ: فڕێ دەیتە.

ئۆغرم: کارەسات.

ئەستووند: ستوون، کۆڵەکە.

ئەگەر: کە.

ئەوین: دڵداری.

ئێرەیی: حەسوودی.

ئێکلام: ئیکرام، تەمەنناکێشان.

ب

باخێوم: بدوێم.

باگەڕ: باهۆز.

بتارێنێ: لەجێی خۆی هەڵکەنێ.

برۆ: تالان.

برێ: هەندێ.

بڕیاریان ڕۆنا: بڕیاریان دا.

بزاوتن: جووڵاندن.

بزاوتۆکە: نیمچە جووڵە.

بژۆڵ: برژانگ.

بلوێرئەنگێو: بلوێرژەن.

بنداڕۆک: سەیران.

بنەمایی: بناغەیی.

بۆسۆ: بەدناو.

بۆڵژن: بۆڵە.

بەدووم: بەد یومن، نەحس.

بەرهەڵدا: بەرەڵڵا.

بەنگی: دڵدار.

بەهاستەم: بەئاستەم.

بێبنکردن: کچێنی لابردن.

بێڵتەپ: زەوی هەڵگێرانەوە بە پێمەڕە.

بێوانی: بوورانەوە. خاوی.

بیور: تێغی مل پەڕاندن.

پ

پاداشت: مکافاة.

پاکار: بەردەست.

پاوان: لەوەڕگەی قەدەغەکراو.

پڕووشە: وردە باران و وردە بەفر.

پۆڕ: قژ.

پەرجوو: موعجیزە.

پەرچینکردن: چەسپاندن.

پەمبەیی: پەمەیی.

پەنام: نهێنی.

پەیدۆز: پەیجۆر.

پێ حەسییان: هەستیان پێ کرد.

پێدەشت: سەرەتای دەشت لە بنی چیاوە.

پیل: پەل.

پێور: ئەستێرەی ورد، وردە پریشکی ئەستێرە پاش کشانی.

## ت

ترنجی: لە ڕەنگی ترنج.

ترۆیک: پۆپە.

تۆرە: نەریت.

تووک: نزای خراپ.

توێتکە: ئارام.

تەقا: هاتو، بەڵکو.

تەقتەقە تاوێر: تەختە بەرد.

تەیار: ئامادە.

تەیر و توو: تەیر و تووال، پەلەوەر.

تێ بردبان: لەناوبردبوونایە.

تیرێژ: ئەو تیشکەی ڕۆژ کە لە دەلاقەوە دێتە ژوورەوە.

## ج

جۆخین: خەرمان.

جۆکەت: ڕیچکۆڵەی ناو بەفر.

جینگڵ: گینگڵ.

## چ

چاومجاغ: ئاگردان.

چما: بۆچی؟

چووبا: چووبوایەتە.

چووک: بچووک.

چەتراسا: وەک چەتر.

چێترین تاژی: خێراترین و بۆ ڕاو شارەزاترین تانجی.

چێرگ: باڵدارێکی گەورەی کێوییە لە جۆری قەلەموون.

چینکە: بەردی ڕەق.

## ح

حەلحەلە: کەشکەلان.

حەوتووی دادێ: حەفتەی داهاتوو.

## خ

خاوەر: ڕۆژهەلات.

خرا: وێران.

خەرتەل: باڵندەیەکی گۆشت خۆری دڕندەیە.

خەرمانە ستێر: کۆمەڵە ئەستێرە.

خەنیم: دوژمن.

د

داخان: پەرت و بڵاو.

داخاوت: قسەی ئەکرد.

داو: تاڵ.

داو و دەهۆ: فڕوفێڵ.

دراو: پارە.

درێو: ناشیرین.

دمگۆ: ئیشاعە. واتەوات.

دوو گـــاسنـە: زەویـیـــەک دووجـــار هەڵدرابێـتـەوە، دووجــار جــووت کــرابێ، وەرد دراوە. کــینایەیە لە دووپاتکردنەوە.

دوند: پۆپە.

دەپەنگایەوە: پەنگی دەخواردەوە.

دەجمێ: دەجووڵێ.

دەچریسکێـتــەوە: دەبریسکێـتــەوە. دەتریسکێتەوە.

دەچکێن: دەتکێن.

دەدلۆپێنێ: دلۆپە دەکا.

دەرۆست: دەرەقەت.

دەساژۆ: ڕام.

دەستدا: ملکەچ، ژێردەستە.

دەستەکوتکێ: پەلەکوتکێ، پەلکوتان.

دەعامڵاند: موعامەلەی لەگەڵ ئەکرد.

دەمنی: وەک.

دەمــی چــوویــووە کــلـیـلــە: دەمــی بەسترابوو.

دەنەدەنە: دەندە، پەراسوو.

دەو: لەو.

دەودەوانێ: پێشبڕکە (مسابقە).

دەیئاژوا: لێی ئەخوڕی.

دەیاننۆڕیێ: سەیریان ئەکرد.

ر

ڕادەکەنەوە: پیادەکەنەوە.

ڕاستان: تەختان.

ڕاسێ: ڕاست بێتەوە.

ڕاێ ماشتێ: تێی سرەواند.

ڕدێن بژ: ڕدێن پرژ و بڵاو.

ڕفکان: فڕکان.

ڕک: ڕق. ڕژد.

ڕۆخانە: چەم.

ڕۆنرابوو: دروست کرابوو.

ڕەگەڵ: لەگەڵ.

ڕەگەما: ڕەگەز.

ڕەوەز: ئەو گـــەورە شـــاخـــانەی بەسەریەکەوە درێژ دەکشێن.

ڕەها: بەرەڵڵا.

ڕێ نیشت: لێ نیشت.

ز

زاوزاتوول: بەچکە و مەچکە.

زراو: باریک.

زریان: ڕەشەبا.

زنار: کەمەر کاج. شاخی بن کەن.

زۆپ: زەق.

زووراندەوە: تووزاندەوە.

زوورگ: ریزە گردی سوورکان.

زۆزان: کوێستان.

زەمبەر: سینەبەندی بە سلسلە و پلپلە.

زەنگو: ئاوزەنگی.

زێڕکفت: زەڕکفت، بەزێڕ رووکەش کراو.

## ژ

ژوقوماوی: تاڵ.

## س

سارە: بەیانی، سبەینێ.

سانایی: ئاسانی.

سبیانێ: بەیانی.

ستۆ: ئەستۆ.

ستێر: ئەستێرە.

سۆسە: هەست. سۆراغ.

سۆنگە: هۆ.

سەدەقی خۆی لێ دەدا: ڕای خۆی دەردەبڕی.

سەرنگرێ: پێ هەڵکەوتن، نووچدان.

سەرۆک ڕەوەند: سەرکۆچەر.

سەرەودەرە لێ دەرنەکردن: کینایەیە لە نەشارەزایی.

سیکارد: کێردی زۆر گەورە.

سێ گاسنە: بڕوانە: دوو گاسنە.

## ش

شاگەشکە: ئەوەی لە خۆشییاندا وەخت بێ شێت ببێ. کینایەیە لە شادمانیی زۆر.

شایی: جۆرە پارەیەکە، کینایەیە لە کەمترین نەخت.

شتاقیان: هیچ کەسێکیان.

شتها: شتەها، چەند جۆرە شت.

شمش شمش: دەمار دەمار.

شیپانە: لاشیپان.

## غ

غریو: هاوار هاوار.

## ق

قامک: پەنجە.

قۆشەن: لەشکر.

## ک

کاژ: درەختێکە لە جۆری گەز و سەروو و سنەوبەر.

کڕ: کپ.

کرێت: دزێو، ناشیرین.

کوتکاسن: کوتکێ لە ئاسن دروست کرابێ.

کۆچلەبەر: ئەوەی لەسەر ڕۆیشتن بێ.

کونەباچکە: تاقی بچکۆلەی دیوەودەر کە بای لێوە دێ.

کەپۆ: لووت.
کەزی: پەلکە.
کەسەر: خەفەت.
کەڵەوەکێشی: سەرکێشی.
کەمدوو: ئەوەی کەم قسە بکا.
کەور: بەرد.
کەونارا: کۆن و بە شکۆ.
کێشکە: چۆلەکە.
کێلەڕێ: نیشانەی سەر ڕێ بۆ ڕێنوێنی.

## گ

گازاندە: گلەیی.
گرزە: چەپک.
گنجی لووت: ئەو شوێنەی لووت کە ئەسووتێتەوە.
گورمیلە: خڕ و تۆپ.
گۆرین: ناوبراو، تاین.
گۆومند: شایی.
گوێ دێرە: گوێ بگرە.
گوێ ڕاداشتن: گوێ ڕاگرتن.
گوێن: جۆر.
گەڕناس: کەڵەمێرد.
گەواڵەگەواڵە: گلۆت گلۆتی هەور، پارچە پارچەی هەور.

## ل

لوا: بەرگن، خوری بەرخی ساڵێ
لە دوور ڕا: لە دوورەوە.
لە هەژمەتان: لە تاوانا.

## م

متبەق: چێشتخانەی ماڵان.
متەقیان نەکرد: ورتەیان لێ نەهات.
مۆڵ درا: کۆکرایەوە بۆ حەسانەوە.
میچ: سەقف.

لە تەمەنی حەڤدە – هەژدە ساڵیمەوە بیروباوەڕی چەپڕەوییانەم لە خۆمدا بەدی کرد. هونەرەکەم شان بەشانی ئەو بیروباوەڕە دەڕوا و بستێ لێی جیا نابێتەوە. بڕوام بە دوو شتە: بە هێزی بێ سنووری دوو شت، بە خەللاقییەتی بێ سنووری دوو شت، بە گۆڕانی بێ سنووری دوو شت: ئەویش گەل و سروشتە.

من هونەرەکەم لەگەڵ گەلەکەمدا و بە پشتیوانیی خەللاقییەتی گەورەی گەلەکەم و بۆ گەلەکەم وەبەرهەم دێنم. بیروباوەڕی سیاسیم لە هونەرەکەم جیا نابێتەوە. هەرکەسێ ڕێگەی بەختەوەری لە گەلەکەم بگرێ، بە هونەرەکەم، بە هەموو ژیانمەوە بە گژیدا دەچم.

یەشار کەمال



چاپخانەی



هەولێر کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil

ڕێنووسی یەکگرتوو